# پاڵنەری تەواوکردنی
# هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم



نوسینگەی لێکۆڵینەوە و دیراسات
لە دەوڵەتی ئیسلامی

وەرگێڕانی

عبدالرحمن

ڕەجەب ١٤٣٩ی كۆچی

# پێرست

# پێشەکی (وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمرنا بالعدل والإحسان، والصلاة والسلام على النبي العدنان، الحذار على الكلام بالعدوان، وعلى آله وصحابته الصفوان، وعلى جميع المسلمين رحمة الله والغفران، أما بعد:

إن الكلام في تكفير الأشخاص والطوائف خطير، واليوم نرى الخوض فيه كثير، لذا نقوم له بالتحذير، إلا ما على سنة البشير النذير، عليه صلوات ربه ومنه السلام والتقدير.

فيا ندامة للمتشددين والهلاك للمتنطعين والفلاح للمتنصحين، فإن النصح لا يكون في شيء إلا زانه ولا يرفع عنه إلا هانه.

فموضوعنا الذي نتحدث عنه يحتاج إلى بحث عميق وقول رقيق وفهم دقيق، يكون بالعلم والفهم لا بالجهل والوهم، مستعينا بالمولى ما نريد إبلاغه وبيانه، إن أصبنا فيه فمن الله ذي الفضل الوافر، وإن أخطأنا فمن أنفسنا ومن الشيطان الجائر، فأرجو أن لا يكون من إخواننا من يسيء الظن بنا ولا يلتفت إلى غير قصدنا، فيدخل في قول شاعر: راحت مشرقة ورحت مغربا *** فشتان بين مشرق ومغرب

وأن يكون للحق أهلا و وكيلا، ولا لطريق تعصب أهلا و دليلا، كما يقول ابن حزم: إذا ورد عليك خطاب بلسان أو هجمت على كلام في كتاب فإياك أن تقابله مقابلة المغاضبة الباعثة على المغالبة قبل أن تتبين بطلانه ببرهان قاطع.

سوپاس و ستایش بۆ الله تعالى کە قەدەری وابوو ئەم کتێبە بکەوێتە بەرچاوم و بیخوێنمەوە، کە بووە هۆی ئەوەی زۆر بە جوانی و ڕێکی لە بابەتی (من لم يكفر الكافر فهو كافر) بگەم بە تێگەیشتنی مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، دوور لە تێگەیشتنی خەواریجە زیادەڕەوەکان و مورجیئە و جەهمیە شلڕەوەکان، وە دواتر سوپاس بۆ (مكتب البحوث و الدراسات)ی دەوڵەتی ئیسلامی (الله تعالى بیپارێزێت و بەردەوامی پێ بدات) کە هەڵساون بە نوسینی ئەم کتێبە گرینگ و بە سوودە کە یەکێکە لە گەورەترین و چاکترین کتێبەکانیان هەم لە ڕووی ژمارەی لاپەڕە وە هەم لە ڕووی بابەتی کتێبەکە، وە ئەوەی گرینگی ئەم کتێبە زیاتر دەکات ئەوەیە کە لەلایەن دەزگایەوە نوسراوە کە بە فرمانی ئەمیری ئیمانداران خەلیفە (أبو بكر البغدادي - حفظه الله) دامەزراوە، وە هەر کتێبێک لەم دەزگایە بنوسرێت لەژێر چاودێری

خۆی یان جێگرەکەی دەبێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەرهەمەکانی ئەم دەزگایە فەرمی ترین بەرهەمی دەوڵەتی ئیسلامین و ڕێک گوزارشت لە بیروباوەڕی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن چونکە لە ژێر چاودێری ئەمیری ئیمانداران یان جێگرەکەی بەرهەمەکان دەنوسرێن و بڵاودەکرێنەوە (بڕوانە کتێبی "التوضيحات لبعض أعمال مكتب البحوث و الدراسات خلال عامين" لاپەڕە 3) بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نیە کە دەزگاکانی تری دەوڵەتی ئیسلامی هیچی فەرمی نین، بۆ نموونە دەزگای (الهمة) یەکێکە لە دەزگا فەرمیەکان، وە چەندانی تریش.

بەهۆی ئەو تێکەڵ کردنەی کەسانێک تێیکەوتوون دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە کە بە (هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم) ناسراوە، چ لەلایەنی زیادەڕەوی کە بەرەو زنجیرەی نەبڕاوەی تەکفیرت دەبات، وە چ لەلایەنی شلڕەوی کە بەرەو کوفری جەهمیەکانت دەبات، بۆیە دەوڵەتی ئیسلامی بە پێویستی زانی ئەم کتێبە بنوسێت لە کاتێکدا کە دەوڵەتی ئیسلامی لە بەرامبەر توندترین هێرشی دوژمنانی ئیسلامدایە و زۆرێک لە خاکەکانی لە دەستداوە، هەروەک خۆیان دەڵێن لە ژێر دەنگی گوللـە و بۆردومانکردنی فڕۆکەکان ئەم کتێبە نوسراوە.

ئەم کتێبە لە مانگی (محرم)ی ساڵی 1439 کۆچی نوسراوە لە (28 - 10 - 2017) زایینی بڵاوکراوەتەوە، ئاشکرایە کە لەم کاتەدا دەوڵەتی ئیسلامی لە چ شەڕێکی توند دابووە لە بەرامبەر دوژمنانی دیندا، ئەمەش گرینگی ئەم کتێبە دەردەخات کە لە کاتێکی ئاوادا دەست بکەن بە نوسینی.

کتێبەکە لە دوو بەش پێکهاتووە، بەشی یەکەم تایبەتە بە بابەتی کافربوون و نەبوونی ئەو کەسەی دەوەستێ لە تەکفیرکردنی کافران، وە بەشی دووەم تایبەتە بە کافربوون و نەبوونی ئەو کەسەی موسڵمانان تەکفیر دەکات بە ناحەق، هەر بەشێک دابەشکراوە بۆ سەر پێنج بابەت، وە هەر بابەتێک چەند حاڵەت و پلەیەکی جیاواز لە خۆ دەگرێت، هەموو بابەتەکانیش بە بەڵگەی قورئان و فەرمووده و ووتەی زانایان باسکراوە.

منیش دوای خوێندنەوەی کتێبەکە بە پێویستم زانی وەریگێرم بۆ سەر زمانی کوردی لەبەر ئەم تێکەڵ کردنەی کە هەیە لە بابەتەکەدا، بە تایبەتی لەلایەن زیادەڕەوانی تەکفیرکە هیچ زەبت کردنێکیان نیە لە بابەتەکدا هەموو قاعیدەکان بە گشتی وەردەگرن، وە هەندێک لە پشتیوانانی دەوڵەتی ئیسلامی لە ترسی توشبوون بە دەردی خەواریج یان مورجیئە نازانن چۆن ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە زەبت بکەن بە جۆرێک نە ببن بە خەواریج وە نە ببن بە مورجیئە، بۆیە هیوادارم هەرچی موەحید هەیە ئەم کتێبە بخوێنێتە بە جوانی و زەبتی بکات، تاوەکو مامناوەند بێت لەنێوان خەواریج و مورجیئەدا.

وە ئەم پێشەکیە عەرەبیەم تایبەت بۆ زیادەڕەوانی تەکفیر نوسیوە کە موخالیفی دەوڵەتی ئیسلامین و تەکفیری دەکەن، ووشانێکیان بۆ نوسراوە لە زێر، هیوادارم جوان بیخوێننەوە، کە تیایدا داوایان لێدەکەم هەر لە سەرەتاوە حوکم لەسەر کتێبەکە نەدەن بەڵکو بە تەواوی بخوێننەوە و بە ئینصافەوە حوکمی لەسەر بدەن.

سەبارەت بە ناوی کتێبەکەش "الباعث على إتمام الناقض الثالث" واتا ("پاڵنەر یان هۆکار" بۆ تەواوکردنی هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم)، مەبەست لە تەواوکردنیش زەبت کردنی هەڵوەشێنەرەوەکەیە نەوەک تەواوکردنی ناتەواویەک لەهەڵوەشێنەرەوەکەدا.

**تێبینیەک:** ژمارەم بۆ ووتەی زانایان داناوە بەگوێرەی حاڵەتەکان و پلەکان، بەڵام نوسەری کتێب ژمارەی بۆ ووتەی زانایان داناوە بەگوێرەی بابەتەکان، ئەم کارەم بۆ ئەوە کرد تا داڕشتنی کتێبەکە جوانتر بێت، بۆ نموونە کە دەبینن ووتەی زانایەک ژمارە (32)ە لە کتێبە عەرەبیەکەدا کەچی لە وەرگێڕانەکە بۆتە ژمارە (7)، وامەزانن هەڵەیە بەڵکو هۆکارەکەی ئەوەیە کە باسم کرد.

لە کۆتاییدا دەڵێم: سوپاس و ستایش بۆ الله تعالى کە یارمەتیدام بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە، هیوادارم جێگای ڕەزامەندی الله تعالى بێت و پاداشتی دەوڵەتی ئیسلامی و وەرگێڕیش بداتەوە بە خێر، وە سوودی هەبێت بۆ موەحیدان.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# پێشەکی (مكتب البحوث و الدراسات)

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، ونشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، ونشهد أن محمدا عبده ورسوله، أما بعد :

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد (ﷺ)، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار، ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا﴾ [النساء : 1]، ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا - يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ [الأحزاب : 70-71]، ثم أما بعد:

ئەم کتێبە چەند لایەنێکی گرینگی یەکێک لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامی تێدا باس دەکەین، ئەو هەڵوەشێنەرەوەی کە ناوی لێنراوە بە دەستەواژەی (هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم) بەگوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی کە شێخی نوێکەرەوەی دین (محمد بن عبد الوهاب) رحمه الله دایناوە بۆ دە هەڵوەشێنەرەوەکەی ئیسلام.

وە پاڵنەر لە نوسینی ئەم کتێبەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تێکەڵکردن و نارێکیەی کە دەیبینین و دەیبیستین لە هەندێک کەسدا لە باسکردنی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیەدا، وە نەبوونی تێگەیشتنێکی ڕێک و پێک بۆ ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە لە چوارچێوەی مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەت، تا وای لێهات جورئەتی هەندێک کەس دەبینی و دەبیستی لە تەکفیرکردنی موسڵمان بە بچووکترین گومان، وە بەبێ بوونی بچووکترین لێکۆڵینەوە بە پاساوی ئەوەی (وەرع)یان هەیە، ئەمەش لە ترسی ئەوەیە بکەونە ناو کوفر بەهۆی تەکفیرنەکردنی کافر، جا وەکو ئیحتیاط خەڵکی کافر دەکەن، گومانیان وایە گەر کەسێک موسڵمانێک بە ناحەق تەکفیربکات گەورەترین شت کە توشی دەبێت هەڵەیەک و گوناهێکە، لە مێشکیاندا چەسپاوە کە بۆ ئیحتیاط وەرگرتن لە پاراستنی دینەکەیان دەبێت خێرا بکەن لە تەکفیرکردندا، تەنانەت لەو حاڵەتانەی کە ئەگەر لەخۆ دەگرێت.

بەم هۆیە دەرگا کرایەوە بە هەردوو لایدا بۆ خۆهەڵدانە ناو زنجیرەی تەکفیرکردنی موسڵمانان بە ناحەق و بەزاندنی موحەرڕەماتیان بەبێ بوونی هیچ پاڵپشتێکی شەرعی، لە ئەنجامی تێگەیشتنی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە بە شێوەیەکی موجمەل بە تەنهایی، وە زۆر دوورە لە

**مامناوەندیەتی ئەهلی سوننە و جەماعەت، ئەمەش بووە هۆی هەڵوەشانەی چەندەها پەیوەندی شەرعی تەئکید لەسەرکراو لەلایەن هەندێک کەس کە زیادەڕەوبوون لە یەکێک لە لایەنەکانی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە و گوێیان نەداوە بە ووردەکارییەکەی و لایەنەکانی تری، کە بە پەرچدانەوەیەکی شەرعی دادەنرێت بۆ ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق، ڕێک بەهەمان شێوە لایەنەکەی تری بە پەرچدانەوەیەکی شەرعی دادەنرێت بۆ ئەو کەسەی دەوەستێت لە تەکفیرکردنی کەسێک کە بە بەڵگەی شەرعی کوفرەکەی چەسپاوە. وە حاڵی ئەو کەسانەی کە زیادەڕەون یان ساردن لەم بابەتەدا، وەکو ئەوا حاڵی ئەو کەسە وایە کە تەوحید تەنها بە نەفی کردن دەزانێت بەبێ ئیثبات کردن، جا تەوحیدی کورت کردۆتەوە لە نەفی کردندا بۆ ئەوەی ڕابکات لە (التشبیه)، جا کەوتە ناو شیرکی (التعطیل)، یان کەسێک کە تەوحید تەنها بە ئیثبات کردن دەزانێت بەبێ نەفی کردن، جا تەوحیدی کورت کردۆتەوە لە ئیثبات کردنێکی بەبێ (التنزیه)، وە بێگومان بابەتی ناولێنان و حوکمدان (الأسماء والأحکام) بەندە بە نەفی کردن و ئیثبات کردنی ئیسلام یان کوفر لەسەر کەسەکاندا بە دیاریکراوی.**

**جا هەر کەسێک گومانی وابێت ئەم حوکمانە کورت کراونەتەوە لە نەفی کردندا بە تەنها، ئەوا ئەم حوکمانە کورت دەکاتەوە تەنها لە تەکفیرکردنی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کەسێک، وە تەکفیرکردنی ئەو کەسەش کە دەوەستێت لە تەکفیرکردنی کەسە وەستاوەکە ..... تا ئەوەندەی الله بیەوێت بەدوایدا دەڕوات، لە ترسی ئەوەی بگات بە الله بە کافری بەهۆی وەستانی لە حوکمدان دەربارەی کافرێک، جا دەفتەرەکەی بە شێوەیەک پڕدەکات لە تەکفیرکردنی موسڵمانان بە ناحەق کە جگە لە الله هیچ کەس نازانێت، ڕێک بە هەمان شێوەی ئەو مورجیئە زیادەڕەوانەی کە کۆشش دەکەن بۆ نەکەوتنە ناو تەکفیرکردنی کەسێک کە خۆی داوەتە پاڵ ئیسلام گەرچی توشی چەندەها هەڵوەشێنەرەش بووبێت، لە ترسی ئەوەی بگەن بە الله بە کافری بەهۆی تەکفیرکردنیان بۆ موسڵمانان، جا دەفتەرەکانیان پڕدەکەن بە درۆ خستنەوە و ڕەتدانەوەی دەقە شەرعیەکان کە بەڵگەن لەسەر تەکفیرکردنی موشریکان گەرچی خۆشیان دابێتە پاڵ ئیسلام.**

### عبيد الله العيشي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) ووتەکەی چەندە جوانە کە دەڵێ:

الله تعالى هیچ فرمانێکی بە بەندەکانی نەکردووە ئیللا شەیطان دوو دەستی دەخاتە ناویەوە بە فێڵ، یان زیادەڕەوی یان شلی، جا بەهەر کامیان سەرکەوت پێی ڕازییە. {رواه الخطابي في العزلة} لا 97

### تابعی بكر بن عبد الله المزني (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:

ئاگاداری ئەوە بە کە بە کەسێکی موسڵمان بڵێی کافر، یان بە کەسێکی کافر بڵێی موسڵمان. {رواه الفريابي في القدر - بسند صحيح} لا 256/ ژ 391

### شێخ عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:

شەیطان زۆربەی خەڵکی لاداوە لەسەر حەق لەم بابەتەدا، وای لە کۆمەڵێک کردووە شل بن، جا حوکمی ئیسلامیان داوە بەسەر کەسێکدا کە دەقی قورئان و سوننەت و ئیجماع بەڵگەیە لەسەر کوفرەکەی، وە وای لە هەندێک کۆمەڵ کردووە زیادەڕەوی و سنوربەزاندن بکەن، جا کەسێکیان تەکفیرکردووە قورئان و سوننەت لەگەڵ ئیجماعیش حوکمی ئەوە دەدەن کە ئەو کەسە موسڵمانە. {الدرر السنية : 375/10}

### شێخ محمد الكشميري (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:

گەرم و گوڕی و هاندان لە تەکفیرکردنی موسڵمان و دواخستن و ساردی لە تەکفیرکردنی کافر، هەردووکیان یەکسانن لە تاواندا. {فيض الباري : 39/2}

**وە بە بەردەوامی مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەت لە حوکمەکانی تەکفیردا نموونەیەکی زیندووە لەسەر مامناوەندی و ڕێکی، ئەم بابەتەش وەکو بابەتەکانی ترە کە مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەی پێ جیاکراوەتە لە مامناوەندی بوون لە هەموو بابەتەکانی دیندا لەگەڵ خۆپاراستن لە ڕێگاکانی بیدعەچیەکانی ئەهلی زیادەڕەوی یان شلڕەوی، ئەمەش لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ڕێگا ڕاستەکەی الله یە، ڕێگای ئەوانەی کە الله نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و چاکەکاران لەگەڵ خۆپاراستن لە ڕێگا و ڕێچکەکانی غەزەب لێگیراوەکان و گومڕاکان.**

**وە ئەم کتێبەش بەشدارییەکی موتەوازیعە لە ئێمەوە بۆ گەیشتن بەو هاوسەنگیەی کە مەبەست و داواکراوە لەم بابەتەدا، کە بە یارمەتی الله تعالى دەبێتە هۆی یەکگرتنی کۆمەڵی موسڵمانان و پاککردنەوەی ڕیزەکانیان، کەسێک ناخەنە ڕیزەکەیانەوە کە لەوان نەبێت، وە کەسێک لە ڕیزەکەیان دەرناکەن کە لەوان بێت.**

### عەللامە ابن القيم (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:

لە ڕێزدارترین و بە سوودترین زانستەکان زانستی سنوورەکانە، بەتایبەتی سنووری شەرعی فرمان پێکراو و نەهی لێکراو، جا زیرەکترینی خەڵکە ئەو کەسەیە کە لە هەموو کەسێک زاناترە لەم سنوورانە، تاوەکو شتێک ناخاتە ناویەوە کە تیایدا نەبێت، وە

شتێکی لێ دەرنەکات کە تیایدا بێت ..... جا دادپەروەرترین کەس ئەو کەسەیە کە هەڵدەستێ بە سنووری ئەخلاق و کردەوەکان و شتە مەشرۆعەکان بە عیلم و عەمەلەوە، وباللە التوفیق. **{الفوائد : لا 141} بە دەستکارییەوە**

**وە ئەوەی لەم کتێبەدا پێکاومانە ئەوا لە (اللە)وە بووە بە تەنها، جا ستایش بۆ ئەوە، وە هەرشتێک کە هەڵەمان تیایدا کردووە لە خۆمان و لە شەیطانەوەیە، جا داوای لێخۆشبوون و تەوبە دەکەین لە اللە تعالی، وە داوای سەرکەوتن و پێکان و چەسپان و پێداگری لەڕێگای جیهاد دەکەین لە اللە سبحانە، وە صەلات و سەلام دەدەین لەسەر بەندە و نێردراوەکەی (محمد) باشترینی بەندەکان، وە لەسەر ئال و هاوەڵانی وە ئەوانەی شوێنیان دەکەون بە چاکە تاوەکو ڕۆژی قیامەت.**

# بەشی یەکەم

## ڕوونکردنەوەی بڕگەی یەکەم لە هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم

**بابەتی یەکەم:** ووتەی زانایان دەربارەی هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم.

**بابەتی دووەم:** بەڵگەکان لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی کافر.

**بابەتی سێیەم:** هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کافر.

**بابەتی چوارەم:** پلەی تەکفیرکردنی کافر لە دیندا.

**بابەتی پێنجەم:** پلەی کەسە وەستاوەکان لە تەکفیرکردنی کافران وە حوکمەکانیان.

# بابەتی یەکەم

## ووتەی زانایان دەربارەی هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم

زانایان بەدوای باسکردنی کوفری ئەو کەسەدا چوونە کە کافرێک تەکفیرناکات، وە ووتەکانیان دەربارەی باسکردنی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە جۆراوجۆرە، هەیانە باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیەی کردووە بە ڕەهایی، وە هەیانە باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی ئەوانەی لەسەر دینی ئیسلام نین بە گشتی، وە هەیانە باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی چەند کۆمەڵێک بە دیاریکراوی کە لەسەر دینی ئیسلام نین، وە هەیانە باسی تەکفیرکردنی هەرکەسێکی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی کۆمەڵێکی دیاریکراو کە کەوتوونەتە ناو کوفر بەڵام هەر خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، وە هەیانە باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی کەسێک کە کەوتۆتە ناو جۆرێک لە جۆرەکانی کوفر، وە لەمەی خوارەوەدا باسی ئەم ووتانەیان دەکەین کە لەسەری وەستاوین:

### **یەکەم:** ئەوەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەی کردووە بە ڕەهایی:

**1. سلمة بن شبيب (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک شایەتی نەدات بە کافربوونی کافر ئەوا کافرە.

**{خطيب البغدادي : تاريخ بغداد} 315/8**

**2. أبو الحسين الملطي الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەموو ئەهلی قیبلە هیچ خیلافێک نیە لەنێوانیان دەربارەی ئەوەی کە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کوفری کافرێک ئەوا کافرە.

**{التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع : لا 40} بە دەستکارییەوە**

**3. شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک موشریکان بە کافر دانەنێت، یان گومانی هەبێت لە کافربوونیان یان بیروباوەڕیان بە ڕاست دابنێت ئەوا ئەوکەسە کافرە بە ئیجماع. **{الدرر السنية : 91/10}**

***

**دووەم: ئەوەی باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی ئەوانەی لەسەر دینی ئیسلام نین بە گشتی.**

**1. القاضي عياض** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

ئەو کەسە تەکفیر دەکەین کە تەکفیری کەسێک ناکات کە لەسەر دینێکە لە دینەکان جگە لە دینی موسڵمانان، یان بوەستێ لە تەکفیرکردنیان یان گومانی هەبێت، یان بیروباوەڕیان بە ڕاست دابنێت، ئەگەرچی ئیسلامەتی خۆی نیشان بدات و باوەڕی بە ئیسلام هەبێت. وە باوەڕی وابێت جگە لە ئیسلام هەموو بیروباوەڕێک باطلە، ئەم کەسە کافرە بەهۆی نیشاندانی شتێک کە پێچەوانەی ئەو شتەیە کە نیشانی دەدات.

{الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 286/2}

(وەرگێڕ: واتا تەکفیرنەکردنی غەیری موسڵمانان پێچەوانەیە لەگەڵ ئیسلام بوون)

**2. النووي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

هەرکەسێک تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە لەسەر غەیری دینی ئیسلامە وەکو نەصارا یان گومانی هەبێت لە تەکفیرکردنیان یان بیروباوەڕیان بە ڕاست دابنێت ئەوا کافرە.

{روضة الطالبين : 70/10}

**3. الحجاوي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **باسی ئەوە دەکات:**

هەرکەسێک تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە لەسەر غەیری دینی ئیسلامە وەکو نەصارا یان گومانی هەبێت لە کافربوونیان یان بیروباوەڕیان بە ڕاست دابنێت ئەوا کافرە.

{الإقناع : 298/4} بە دەستکارییەکی کەم

**4. البهوتي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **باسی تەکفیری ئەو کەسە دەکات:**

کە تەکفیری ئەو کەسە نەکات کە لەسەر غەیری دینی ئیسلامە وەکو ئەهلی کیتاب یان گومانی هەبێت لە کافربوونیان یان بیروباوەڕیان بە ڕاست دابنێت.

{شرح منتهى الإرادات : 395/3}

***

**سێیەم: ئەوەی باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی چەند کۆمەڵێک بە دیاریکراوی کە لەسەر دینی ئیسلام نین.**

**1. الإمام أبو بكر بن عياش (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

ئایا گومان دەکرێت لە یەهود و نەصارا کە کافر بن !؟ هەرکەسێک گومانی هەبێت کە ئەوان کافرن ئەوا ئەو کەسە کافرە. {مسائل حرب الكرماني : 1129/3}

**2. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک دوای ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) مانەوە لەسەر دینی یەهود و نەصارای پێ حەرام نەبێت، بەڵکو هەرکەسێک تەکفیریان نەکات و ڕقی لێیان نەبێت ئەوا ئەو کەسە موسڵمان نیە بە یەکدەنگی موسڵمانان. {مجموع الفتاوى : 464/27}

**3. شێخ عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە یەهود و نەصارا بە کافر دانانێت یان گومانی هەیە لە کافربوونیان. {الدرر السنية : 69/12}

**4. شێخ سليمان بن سحمان (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

دان بەوە دەنێین کە یەهود و نەصارای ئەمڕۆ جاهیل و تەقلیدکەرەوەن، وە باوەڕمان وایە کافرن، وە ئەو کەسەش کافرە کە گومانی لە کافربوونی ئەواندا هەبێت.

{الضياء الشارق في رد شبهات الماذق المارق : لا 374}

***

**چوارەم: ئەوەی باسی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی کەسێکی دیاریکراو یان کۆمەڵێکی دیاریکراو کە ئیجماعی صەحیح هەیە لەسەر کوفرەکەیان بەڵام هەر خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام.**

**1. الإمام أحمد بن حنبل (رحمه الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک هەموو ئەم کۆمەڵەیە "جەهمیەکان و ئەوانەشی دەوەستن لە تەکفیرکردنیان" تەکفیرنەکات ئەوا وەکو ئەوانە. {طبقات الحنابلة : 29/1}

ئەمە یەکێکە لەو دوو ڕیوایەتەی کە لە ئیمام ئەحمەدەوە دەگێڕدرێتەوە

**2. أبو خيثمة زهير بن حرب (رحمه الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی جەهمیەکان ئەوا کافرە.

{رواه أبو شاهين في شرح مذاهب أهل السنة} لا 31/ ژ 27

**3. إسماعيل بن المقري (رحمه الله) دەڵێ:**

گومان هەبوون لە کافربوونی "شوێنکەوتوانی ابن عربي" کوفرە.

{مغني المحتاج : 97/4}

(وەرگێڕ: ابن عربي کەسێکی زۆر ڕۆچوو بوو لە تصوف، کوفرەکانی ناژمێردرێت)

**4. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی "شوێنکەوتوانی ابن عربي" دەڵێ:**

ئەوەندەت بەسە بۆ زانینی کوفرەکەیان کە سادەترین ووتەیان ئەمەیە: (فیرعەون بە ئیمانەوە مرد بەری بوو لە هەموو گوناهێک) ..... لە کاتێکدا خاوەنی هەموو دینێک لە موسڵمان و یەهود و نەصارا دەزانن فیرعەون یەکێک بوو لە کافرترین بوونەوەرەکان بە الله. {مجموع الفتاوى : 125/2}

(وەرگێڕ: ابن عربي و ابن العربي هەیە، تێکەڵیان مەکەن)

**5. شمس الدين الحليبي (رحمه الله) دەربارەی "ابن عربي" دەڵێ:**

ئەو کافرە، کوفری ئەو لە کوفری یەهود و نەصارا و بت پەرستان توندترە، وە پێویستە کتێبەکانی بسوتێنرێ، وە هەرکەسێک باوەڕی وابێت کە ئەو ئیسلامە، ئەوا ئەو کەسە کافرە. {زين الدين الملطي : نيل الأمل في ذيل الدول 352/7

**6. شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رحمه الله) دەربارەی "ابن عربي" دەڵێ:** زانایان باسیان کردووە کە ئەو لە یەهود و نەصارا کافرتر بووە، وە هەندێکیان ووتویانە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی شوێنکەوتوانی ابن عربي ئەوا ئەو کەسە کافرە. {الدرر السنية : 45/2}

**7. شێخ سليمان بن سحمان (رحمه الله) دەربارەی "ابن عربي وابن الفارض" دەڵێ:** ئەوان کافرترین خەڵکی سەر زەوین لەلای زانایانی لێکۆڵەر، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان ئەوا ئەو کەسە کافرە.

{البيان المبدي لشناعة قول المجدي : لا 124}

**8. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی "الدروز" دەڵێ:**

موسڵمانان خیلافیان نیە لە کافربوونی ئەمانە، بەڵکو هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان ئەوا ئەو کەسە کافرە. {مجموع الفتاوى : 162/35}

**9. وەهەر ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی ئەوانەی کە باوەڕیان بە "الحلول و الإتحاد و وحدة الوجود" هەیە دەڵێ:** هەرکەسێک گومانی لە کافربوونی ئەمانە هەبێت دوای زانینی بیروباوەڕیان و ناسینی دینی ئیسلام ئەوا ئەو کەسە کافرە، هەروەک ئەو کەسەی کە گومانی هەبێت لە کافربوونی یەهود و نەصارا و موشریکان.

{مجموع الفتاوى : 368/2}

**10. الرحيباني (رحمه الله) دەڵێ:**

"الدروز و التيامنة" کە بیروباوەڕی "القرامطة و الباطنية"یان هەیە، وە "الدهرية و الحلولية و النصيرية و الإسماعيلية و هاوشێوەکانیان" هەموویان زندیق و مولحیدن، بیروباوەڕیان لەیەکتر نزیکە، وە موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر کافربوونی ئەمانە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان ئەوا وەکو ئەوان کافرە.

{المطالب أولي النهى : 285/6}

**11. شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رحمه الله) دەڵێ:**

کەسێکی ڕافیزی ئەگەر باوەڕی وابوو "علي يان حسين" وەکو الله شتیان پێ دەکرێ ئەوا ئەو کەسە کافرە بە ئیجماع، وە کەسێکی سونی گەر گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەم ڕافیزەیە ئەوا ئەویش کافرە. {الدرر السنية : 129/10} بە دەستکارییەوە

**12. أبو السعود دەربارەی ڕافیزە دەڵێ:**

زانایانی هەموو سەردەمەکان یەکدەنگ بوونە لەسەر حەڵاڵی کوشتنیان، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان ئەوا ئەو کەسە کافرە.

**{ابن عابدین : العقود الدرية} 103/1**

**13. وە هەندێک لە پێشەوایانی بانگەوازی نەجدی دەڵێن:**

هەرکەسێک موشریکەکانی دەوڵەتی تورکی و گۆڕپەرستان بە کافر دانەنێت، وەکو خەڵکی مەککە و جگە لەوانیش کە پیاوچاکان دەپەرستن، وە لایانداوە لە تەوحیدە بۆ شیرك، وە سوننەتی پێغەمبەری خوایان گۆڕیوە (ﷺ) بە بیدعە، ئەوا ئەو کەسە کافرە وەکو ئەوان. **{الدرر السنية : 291/9}**

**14. الملا علي القاري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی "دەججال" دەڵێ:**

هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافری و درۆزنی دەججال، ئەوا ئەو کەسە کافربووە.

**{مرقاة المفاتيح : 3470/8}**

***

**پێنجەم: ئەوەی باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی کەسێک کە کەوتۆتە ناو یەکێک لە جۆرەکانی کوفری ئیجماع لەسەر.**

**1. پرسیار کرا لە أبو بكر بن عياش (رَحِمَهُ اللهُ) دەربارەی ئەو کەسەی کە دەڵێ قورئان مەخلوقە، ئەویش لە وەڵامدا ووتی:**

کافرە، وە هەرکەسێک نەڵێ کافرە ئەوا ئەویش کافرە.

{مسائل حرب الكرماني : 1129/3}

**2. الإمام سفيان بن عيينة (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:**

قورئان کەلامی الله یە عز وجل، هەرکەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک گومانی لە کافربوونی هەبێت ئەوا ئەویش کافرە.

{رواه عبد الله بن الإمام أحمد في السنة - بسند صحيح} ب 1/ لا 112/ ژ 25

**3. الإمام أحمد بن حنبل (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا ئەویش کافرە. {طبقات الحنابلة : 173/1}

ئەمەش یەکێکە لە ڕیوایەتەکان کە لە ئیمام ئەحمەدەوە دەگێڕدرێتەوە

**4. يزيد بن هارون (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک تەکفیری نەکات ئەوا ئەویش کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا ئەویش کافرە.

{رواه ابن بطة في الإبانة الكبرى} ب 6/ لا 57/ ژ 257

**5. هەردوو ئیمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي (رَحِمَهُمَا اللهُ) دەڵێن:**

هەرکەسێک وادابنێت قورئان مەخلوقە ئەوا کافر بووە بە الله ی گەورە، کوفرێک کە دەری دەکات لە دین، **وە هەرکەسێک لەوانەی لەم شتە تێدەگات*** گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا ئەویش کافرە.

{اللالكائي : شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة} ب 1/ لا 197/ ژ 321

*(وەرگێڕ: بڕوانە و جیاوازی ووتەکەیان بزانە لەگەڵ ووتەی زانایانی پێشوو).

### 6. هارون بن موسى الفروي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

قورئان کەلامی الله یە مەخلوق نیە، وە هەرکەسێک بڵێ مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی (الواقفة) ئەوا ئەویش کافرە.

{رواه عبد الله بن الإمام أحمد في السنة - بسند صحيح} ب 1/ لا 173/ ژ 211

(وەرگێڕ: الواقفة – ئەوانەن کە دەڵێن: نە دەڵێین قورئان مەخلوقە، وە نە دەڵێین قورئان کەلامی الله یە، واتا دەوەستن و حوکم لەسەر قورئان نادەن بەهیچ جۆرێک، بۆیە پێیان دەووترێ الواقفة واتا وەستاو).

وە ئیمام ئەحمەد دەربارەی الواقفة دەڵێ: (گەر لە شارەزایی هەبوو لە "علم الكلام" ئەوا جەهمیە "واتا کافرە" وە ئەگەر کەسێکی جاهیلی سادە بوو شارەزایی نەبوو لە "علم الكلام" ئەوا ئیقامەی حوججەی لەسەر دەکرێت بە ڕوونکردنەوە و بەڵگە هێنانەوە، گەر تەوبەی کردوو و باوەڕی هێنا کە قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە ئەوا باشە، ئەگینا لە جەهمی خراپترە).

(وەرگێڕ: تەنانەت ئەوەی ووتویەتی: قورئان کەلامی الله یە پاشان بێدەنگ بووە، لەویشیان قبوڵ نەکردووە تاوەکو ووتویەتی: قورئان کەلامی الله یە و مەخلوق نیە).

### 7. أبو خيثمة زهير بن حرب (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک وادابنێت کە قورئانی کەلامی الله مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا ئەویش کافرە.

{شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة : 282/2}

### 8. عبد الله بن عمر بن الرماح (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک بڵێ قورئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێ بڵێ هەینی واجب نیە ئەوا کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەمانە ئەوا ئەویش کافرە.

{الذهبي : تاريخ الإسلام} ب 5/ لا 851/ ژ 218

### 9. محمد بن سحنون (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

زانایان یەکدەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کەسێک جنێو بە پێغەمبەر (ﷺ) بدات و لە پلەی پایەی کەم بکاتەوە ئەوا کافرە، وە هەڕەشە و سزای الله ی لەسەرە، وە حوکمی لەلای ئوممەت کوشتنە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی یان سزادانی ئەوا کافر بووە. {الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 215/2}

### 10. القاضي عياض (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

ئەوانەی کە دەڵێن: (زۆرینەی خەڵکی و ژنان و گێلەکان و تەقلیدکەرەوەی نەصارا و یەهود و جگە لەوانیش الله ئیقامەی حوججەی لەسەر نەکردوون، چونکە ئەوانە سروشتێکی وایان نیە کە بتواندرێ بەڵگەیان پێ بهێندرێتەوە).

خاوەنی ئەم ووتانە کافرە بە ئیجماعی ئەوەی هەرکەسێک یەکێک لە نەصارا یان یەهود یان یەکێک واز لە دینی موسڵمانان بهێنێت بە کافر دانەنێت یان بوەستێت لە تەکفیرکردنیان یان گومانی هەبێت لە کافربوونیان ئەوا کافرە.

{الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 280/2}

### 11. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک بڵێ: گەر بت پەرستان واز لە بت پەرستی بهێنن ئەوا جاهیل دەبن بە حەق بە قەدەر وازهێنانەکەیان لە بت پەرستی، ئەوا ئەو کەسە لە یەهود و نەصارا کافرترە، وە هەرکەسێک تەکفیریان نەکات ئەوا لە یەهود و نەصارا کافرترە، چونکە یەهود و نەصارا بت پەرستان تەکفیر دەکەن. {مجموع الفتاوى : 128/2}

### 12. وەهەر ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک لەگەڵ جنێودانی بە هاوەڵان بانگەشەی ئەوەش بکات کە "علي" خوایە یان ئەو پێغەمبەر بووە بەڵام جبريل هەڵەی کردووە لە گەیاندنی پەیامەکە، ئەم کەسە گومان نیە لە کافربوونی، بەڵکو گومان نیە لە کافربوونی ئەو کەسەش کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی. {الصارم المسلول على شاتم الرسول : لاپەڕە 586}

### 13. ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

هیچ گومان لەوە دانیە کە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی بت پەرستان ئەوا واجبە تەکفیر بکرێت، وە واجبە تەکفیری ئەو کەسەش بکرێت کە تەکفیری بت پەرستان ناکات، هۆکاری ئەم تەکفیرکردنەش تەنها ئەوەیە کە کوفری بت پەرست شتێکی زانراوە لە دیندا بە زەڕوڕەت (معلوم من الدين بالضرورة).

{الروض الباسم : 509/2}

**(وەرگێڕ: "معلوم من الدين بالضرورة – زانراوە بە زەڕوڕەت لە دیندا" واتا ئەو شتانەی کە زانا و عەوام وەکو یەک دەیزانن بەبێ جیاوازی، وەکو واجب بوونی نوێژ ...هتد).**

**14. وەهەر ابن الوزير الصنعاني (رحمه الله) دەربارەی "جەبریيه" دەڵێ:**

گەر ئەوان سزادانی پێغەمبەر (ﷺ) بە جائیز بزانن، وە بە جائیزی بزانن ئەبو لەهەب بەر شەفاعەت بکەوێ لە ڕۆژی قیامەت، ئەوا کوفرەکەیان شتێکی زانراوە بە زەروڕەت لە دیندا، وە بە هەمان شێوە کافربوونی ئەو کەسەش کە تەکفیریان ناکات.

{الروض الباسم : 509/2}

**15. البقاعي (رحمه الله) دەڵێ:**

کافر ئەو کەسەیە کە ئینکاری شتێکی زانراوی زەروڕ بکات لە دیندا، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەم جۆرە کەسانە، ئەوا ئەویش کافرە.

{تحذير العباد من أهل العناد ببدعة الإتحاد : 253/2}

**16. شێخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب (رحمهم الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک بڵێ: "لەگەڵ ووتنی دوو شایەتەکە هیچ شتێک زیان بە ئیمانەکەت ناگەیەنێت"، یان بڵێ: "هەرکەسێک دوو شایەتەکە بهێنێ و نوێژبکات و ڕۆژوو بگرێت نابێت تەکفیر بکرێت ئەگەرچی جگە لە الله بپەرستێ"، ئەوا ئەو کەسە کافرە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا ئەویش کافرە، چونکە خاوەنی ئەم ووتەیە خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیجماعی موسڵمانان بە درۆ دەخاتەوە.

{الدرر السنية : 250/10}

**17. شێخ محمد بن عبد اللطيف آل الشيخ (رحمه الله) دەربارەی جەژنێکی شیرکی کە لەلای گۆڕەکان ئەنجام دەدرێت دەڵێ:** هەرکەسێک بە جائیز و حەڵاڵ و عیبادەت و دینی بزانێت، ئەوا ئەو کەسە لە کافرترینەکان و گومڕاترین بوونەوەری الله یە، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان پاش ئیقامەکردنی حوججە لەسەریان ئەوا ئەویش کافرە. {الدرر السنية : 440/10}

**18. وەهەر شێخ محمد بن عبد اللطيف آل الشيخ (رحمه الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک هەندێک شوێن تایبەت بکات بە عیبادەت، یان بڕوای وابێت هەرکەسێک لەم شوێنانە بوەستێ ئەوا فەریزەی حەجی لەسەر لادەچێت، ئەوا کوفری ئەم کەسە گومانی تێدانیە لای کەسێک کە بۆنی ئیسلامی کردبێت، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی، ئەوا بێگومان دەبێت ئیقامەی حوججەی لەسەر بکرێت، وە بۆی ڕوون بکرێتەوە کە ئەمە کوفر و شیرکە، وە پێدانی تایبەت مەندی

بەم دارانە چواندنیەتی بە شەعائیرەکانی الله، کە الله وەستان لای ئەم شتانەی وەکو بەندایەتیکردن بۆ خۆی داناوە، جا ئەگەر ئیقامەی حوججەی لەسەر کرا و هەر سوربوو لەسەر گومانەکەی، ئەوا گومان نیە لە کافربوونی. {الدرر السنية : 443/10}

**(وەرگێڕ: "الله وەستان لای ئەم شتانەی وەکو بەندایەتیکردن بۆ خۆی داناوە" مەبەست لەم ووتەیەی کەعبە و بەردە ڕەشەکە و کێوی عەڕەفە ...هتد ئەم شتانە دەگرێتەوە کە شەرع پیرۆزی کردوون و هەندێک بەندایەتی پێوە بەند کردوون، نەوەک شتانی تر کە گۆڕپەرستان دایان هێناوە).**

**19. شێخ محمد الأمين الشنقيطي (رحمه الله) دەربارەی شوێنکەوتوانی یاسا دانراوەکان دەڵێ:** هیچ کەسێک گومانی لە کوفر و شیرکی ئەمانە نیە، ئیللا کەسێک کە الله ڕۆشنایی لێ سڕی بێتەوە و نابینای کردبێت لە بەرامبەر نوری وەحیدا، هاوشێوەی ئەوان. {أضواء البيان : 259/3}

***

# بابەتی دووەم

## بەڵگەکان لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە وەستاوە لە تەکفیرکردنی کافر

لە بابەتی پێشوودا تێپەڕی بەسەرمان کە ووتەی زانایان جۆراوجۆرە دەربارەی باسکردنی کافربوونی ئەوکەسەی کە کافرێک تەکفیرناکات، جا تێپەڕی بەسەرمان کە زانای وا هەبوو بە ڕەهایی یان بە گشتی تەکفیری دابوو بەسەرهەرکەسێک کە بوەستێ لە تەکفیرکردنی هەرکافرێک، زانای وا هەبوو تەکفیرەکەی بەند کردبوو تایبەت بە چەند کۆمەڵێکی دیاریکراو یان چەند جۆرە کوفرێکی دیاریکراو، بۆیە بەڵگەی زانایان بۆتە جۆراوجۆر دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە بەگوێرەی ئەو حاڵەتەی کە باسیان کردووە، وە لەمەی خوارەوەدا شتێک لەم بەڵگانە باس دەکەین بەگوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی کە لە بابەتی یەکەمدا باسمان کردووە لە ووتەی زانایان دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دەوەستێ لە حوکمدان لەسەرکافر.

### یەکەم: بەڵگەی ئەو کەسەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەی کردووە بە ڕەهایی یان بە گشتی.

وە بەڵگەش لەسەرئەمە دەقی قورئان و ئیجماعە، الله تعالى دەفەرمووێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِن بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا ﴾ [الفتح : 13]، وە دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ - لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴾ [الكافرون :1-2].

(جا ئەوەی موشریکان بە کافردانەنێت ئەوا باوەڕی بە قورئان نیە، چونکە قورئان موشریکانی بە کافر داناوە، وە فرمانی کردووە بە تەکفیرکردنیان و دژایەتیکردنیان و شەڕکردن لەگەڵیان). {الدرر السنية : 291/9}

جا هەرکەسێک قورئانی پێ بگات ناوی کافرلەوکەسە نەنێت کە باوەڕیان بە الله و پێغەمبەرەکەی نیە، یان ناوی کافرلەوکەسە نەنێت کە جگە لە الله دەپەرستێ،

ئەوا ئەو کەسە بە درۆخەرەوە یان پشتێکەرە بەرامبەر ئەم چەند ئایەتەی پێشوو، وە ڕەتکەرەوەی حوکمی الله یە دەربارەی کافران، جا ئەو ووتانەی الله تعالی دەیگرێتەوە: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللَّهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ ﴾ [الزمر : 32]، ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾ [السجدة : 22]، ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ﴾ [الأنعام : 157]، ﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ ﴾ [العنكبوت : 47]، وە چەندەها ئایەتی تر.

أبو الحسين الملطي و شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُمَاٱللَّهُ) ئیجماعیان گێڕاوەتەوە لەسەر ئەم شتە.

***

## دووەم: بەڵگە لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی ئەوانەی لەسەر دینی ئیسلام نین بە گشتی.

هەموو ئەو بەڵگانەی لە پێشوودا باسمان کردن بەڵگەن لەسەر ئەمە، وە چەند ئایەتێکیشی بۆ زیاد دەکەین: ﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ﴾ [آل عمران : 19]، ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ [آل عمران : 85]، ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ [سبأ : 28]، ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ ﴾ [الأحزاب : 40].

جا هەرکەسێک دوای ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو کەسە تەکفیرنەکات کە لەسەر دینێکی ترە جگە لە دینی ئیسلام، ئەوا ئەم کەسە ئەم ئایەتانەیە بە درۆدەخاتەوە، کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی الله جگە لە دینی ئیسلام هیچ دینێکی تر قبوڵ ناکات، وە بەڵگەن لەسەر ئەوەی پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ گشت خەڵکیە، وە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو دوا پێغەمبەرە.

بە هەمان شێوە ئەو کەسەی دوای ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) دەوەستێ لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە نایەتە سەر دینی ئیسلام، ئەوا ئەم کەسە موخالەفەی ئیجماعی قەطعی کردووە، ئەو ئیجماعەی کە ئایەتانی پێشوو بەڵگەبوون لەسەری کە ئەو دوا پێغەمبەرە و بۆ هەموو خەڵکی نێردراوە.

(وەرگێڕ: پێش ئەوەی ووتەی زانایانی تر نەقڵ بکەین بە پێویستی دەزانین لێرەدا چەند ئاماژەیەکی کورت بدەین بە چەند دەستەواژەیەک کە دێتە پێشمان ئەوانیش تایبەتن بە زانستی (أصول الفقه) کە بۆی هەیە لای زۆرێکمان دەستەواژەی نەناسراو بن یان لێیان تێنەگەین، ئێمەش بە کورتی ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر دەدەین بەبێ ڕۆچوونە ناو خیلافی زانایانی أصول الفقه دەربارەیانەوە).

(قطعية الثبوت و ظنية الثبوت - قطعية الدلالة و ظنية الدلالة - الإجماع القطعي و الظني)

قطعية الثبوت: ئەو شتەیە کە بە دڵنیاییەوە جێگیر بووە لەسەر خاوەنەکەی

بۆ نموونە: ئایەتەکانی قورئان هەمووی (قطعية الثبوت)ن چونکە هەمووی جێگیر بووە کە خاوەنەکەی الله یە، ئەوەی ئینکاری لەوە بکات یان گومانی هەبێت ئەوا بێگومان کافرە، بە هەمان شێوە فەرموودە موتەواتیرەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و زۆرێک لە فەرموودەکانی "الصحيحين" و هەندێک فەرموودەی ئاحاد کە سەنەدەکەی کەسانی وای

تێدایە گومان نیە لە ڕاستیەکەی ئەمانە گومانی تێدانیە کە ئەو فەرموویەتی، هەرکەسێک ئینکاری لەوە بکات یان گومانی هەبێت ئەوا بێگومان کافرە.

**ظنية الثبوت:** جێگیربوونی شتەکە لەسەر خاوەنەکەی وەکو ئەوەی پێشوو نیە بڕابێتەوە بەڵکو دانی پێدادەنێن لەگەڵ هەبوونی گومان لە جێگیربوونی، وەکو هەندێک فەرموودە کە کێشە هەیە لەسەر صەحیحیەکەی یان فەرموودەی ئاحاد کە سەنەدەکەی زۆر بەهێز نیە، وە دانانی فەرموودەی ئاحاد لە چوارچێوەی جۆری یەکەم یان دووەم کێشەی لەسەرە لەنێوان "أهل الحديث و أهل الكلام"، ئەهلی کەلام بەهیچ شێوەیەک بە قطعية الثبوتی نازانن، هەیانە بە ڕەهایی ڕەتی دەکاتەوە نەوەک تەنها گومانی هەبێت لە جێگیربوونی.

**طقعية الدلالة:** ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە بە ڕوونی بەڵگەن لەسەر شتێک و هیچ ئەگەرێکی تر وەرناگرن، هەموو ئوممەت یەکدەنگن لە تێگەیشتنی مانای ئایەتەکان.

**قطعية الدلالة:** ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە بە ڕوونی بەڵگە نیە تەنها لەسەر شتێک و ئەگەری تر لە خۆ دەگرێت، بۆیە زانایان ڕاجیان لە تەفسیرکردنی کۆمەڵێک ئایەت و شەرحکردنی کۆمەڵێک فەرموودە.

**الإجماع القطعي:** زانایان یەکدەنگن لەسەر شتێک لەگەڵ هەبوونی دەق شەرعی لەسەر ئەم شتە، وە هەرکەسێک موخالیفی ئەم ئیجماعە بێت کافرە، ئەم ئیجماعە ئەو شتانە دەگرێتەوە کە پێیان دەووترێ (معلوم من الدين بالضرورة) کە زانا و عەوام تیایدا یەکسانن لە زانینی وەکو واجب بوونی نوێژ و ژمارەی نوێژەکان و واجب بوونی زەکات و ڕۆژووی ڕەمەزان و حەج و حەڕام بوونی دزی و درۆ و خواردنی عەرەق و ڕیبا.

**الإجماع الظني:** زانایان یەکدەنگن لەسەر شتێک بەڵام عەوام نایزانن، وە زانینی ئەم ئیجماعە پێویستی بە وورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە و شارەزایی هەیە، وەکو ئەوەی باپیر شەش یەکی بەر دەکەوێت لە میراتدا کە زانایان ئیجماعیان هەیە لەسەری بەڵام زۆربەی عەوام نەیزانن، (ئەوەی موخالەفەی ئەم ئیجماعە بکات بە یەکدەنگی زانایان کافر ناکرێت.

ئەمانەی ووتمان تەنها بۆ بەرچاو ڕۆشنی بوو لە تێگەیشتنی مانای ووتەی زانایان بەبێ ڕۆچوون لە بابەتەکاندا، بۆ زانیاری زیاتر و زانینی خیلافی زانایان لەسەر ئەم دەستەواژانە بگەڕێنەوە سەر کتێبەکانی أصول الفقه).

(وە هەروەها "معلوم بضرورة العقل والفطرة" زۆر دووبارە دەبێتەوە لەم کتێبەدا، واتا ئەو شتانەی کە بەهۆی عەقڵ و فیطرەت دەزانرێ بەبێ دابەزینی وەحی، وەکو تەوحید و شیرك).

**القاضي عياض (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) پێی ڕاگەیاندووین کە ئەو دوا پێغەمبەرە و پێغەمبەری تر نیە لەدوای، وە لە الله تعالى وە پێی ڕاگەیاندووین کە ئەو دوا پێغەمبەرە و بۆ هەموو خەڵکی نێردراوە، وە ئوممەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەم ووتانە بە ڕووکەش (ظاهر) وەربگیرێت و چۆن هاتووە ئاوا تێیدەگەین بەبێ تەئویل کردن و تایبەت کردن، جا هیچ گومانێک نیە لە کافری ئەم کۆمەڵانە هەموویان بە ئیجماعی قەطعی و دەقی قطعية الدلالة. {الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 285/2}

(وەرگێڕ: مەبەستی ئەم کۆمەڵانەیە کە دەڵێن پێغەمبەری تر دێن دوای محمد (صلى الله عليه وسلم) یان دەڵێن پەیامەکەی ئەو بۆ هەموو خەڵکی نیە).

**کەسی موخالیف بۆ ئیجماعی قەطعی کە پاڵپشتی شەرعی لەگەڵدا بێت لە دەقی قورئان و سونەت ئەوا کافرە، وە ئەم ووتەیەی الله تعالى دەیگرێتەوە:** ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴾ [النساء : 115 ].

(وەرگێڕ: کە دەڵێ "کەسی موخالیف" مەبەستی ئەو کەسەیە کە ئینکاری ئیجماعی قەطعی دەکات، نەوەک مەبەستی ئەوە بێت هەر شتێک ئیجماعێکی قەطعی لەسەر بێت ئەوەی ئەنجامی نەدات کافرە، بۆ نموونە ئەوەی ئینکاری "عومرە" بکات کافرە، چونکە ئیجماعی قەطعی هەیە لەسەری هەبوونی عومرە، بەڵام ئەوەی ئەنجامی نەدات کافر نیە).

**لە "الحارث الأشعري"ەوە (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(من فارق الجماعة قيد شبر فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه، إلا أن يرجع).

{سنن الترمذي : ژ2863} وقال الترمذي: هذا حديث حسن صحيح غريب.

(وەرگێڕ: واتا هەرکەسێک بە قەدەر بستێک لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوە ئەوا گرێی ئیسلامی لە ملی داکەندووە، ئیللا مەگەر بگەڕێتەوە ..... ماناکەی فراوانترە بەدوایدا بگەڕێ).

**هەرکەسێک موخالەفەی ئیجماعێک بکات کە دەقێکی قەطعی لەسەر بێت ئەوا خیلاف نیە لە تەکفیرکردنی، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو ئیجماعە قەطعیە یە کە هیچ دەقێک نەبێت پاڵپشتی بکات، جا زانایان دەربارەی ئەو کەسەی کە موخالەفەی ئەم ئیجماعە دەکات دوو جۆر ووتەیان هەیە، بەڵام کەسی موخالیف بۆ ئیجماعی ظني تەکفیر ناکرێت.**

**ابن دقيق العيد (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئیجماع جاری وا هەیە تەواتوری لەگەڵە کە لە خاوەنی شەرعەوە نەقل کراوە (واتا پێغەمبەرﷺ)، وە جاری وا هەیە لەگەڵی نیە، ئەوەی یەکەمیان ئەوەی موخالەفەی بکات خیلاف نیە لە تەکفیرکردنی، ئەوەی دووەمیان خیلاف هەیە لە تەکفیرکردنی.

**{الزركشي : بحر المحيط} 500/6**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

خەڵکی (واتا زانایان) خیلافیان هەیە دەربارەی کەسی موخالیفی ئیجماع، ئایا تەکفیر دەکرێت ؟ دوو ووتەی لەسەر هەیە، وە دوای لێکۆڵینەوە دەردەکەوێ: ئیجماعی مەعلوم موخالیفەکەی تەکفیر دەکرێت هەروەک چۆن موخالیفی دەق بە وازهێنان لە دەق تەکفیر دەکرێت، وە ئەم تەکفیرە لە بابەتێکدا دەکرێ کە بزاندرێ دەقی لەسەر جێگیر بووە، بەڵام زانینی جێگیربوونی ئیجماع لە بابەتێکدا کە دەقی لەسەر نەبێت ڕوونادات، وە ئەو بابەتەی کە مەعلوم نەبێت ئیجماعی لەسەرە ئەوا ڕێگری دەکرێت تیایدا لە تەکفیرکردن. **{مجموع الفتاوى : 270/19}**

**صفي الدين الهندي الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەو کەسەی ئینکاری حوکمێکی ئیجماع لەسەر دەکات کە ئیجماعی لەسەرە بەشێوەی قەطعی ئەوا تەکفیر ناکرێت لەلای زۆرینەی زانایان، بە پێچەوانەی هەندێک فوقەهاء، وە ئێمە ووتەکەمان پەیوەست کردووە بەوەی کە (ئیجماعی لەسەر بێت) چونکە هەرکەسێک ئینکاری واجب بوونی پێنج نوێژەکە و هاوشێوەکانی بکات ئەوا کافر دەبێت، وە پێنج نوێژەکەش ئیجماعی لەسەرە، بەڵام کافر نابێت لەبەر ئەوەی ئیجماعی لەسەرە بەڵکو لەبەر ئەوەی زەرورەتێکی مەعلومە لە دینی محمد (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ)، وە ئێمە بۆیە ووتەکەمان پەیوەست کرد بە (ئیجماعی قەطعی) چونکە ئەو کەسەی ئینکاری ئیجماعی ظني بکات ئەوا کافر نابێت بە هاوڕایی زانایان.

**{نهاية الوصول في دراية الأصول : 2679/6}**

***

**سێیەم: بەڵگە لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی چەند کۆمەڵێکی دیاریکراو کە لەسەر دینی ئیسلام نین.**

ئەو دەق و ئیجماعانەی پێشوو بەڵگە بوون لەسەر تەکفیرکردنی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی ئەم کۆمەڵانە، وە چەند دەقێک زیاد دەکەین کە بەڵگەن لەسەر کافربوونی ئەم کۆمەڵانە بە دیاریکراوی، هەروەک الله تعالی دەفەرمووێ: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾ [المائدة : 17]، وە فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلَاثَةٍ ﴾ [المائدة : 73]، وە هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴾ [المائدة : 78]، وە هەروەها کە فەرموویەتی: ﴿ لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴾ [البينة : 1]، وە چەندان ئایەتی تر.

**لە "أبي هريرة"ەوە (﵁) ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ)ەوە کە فەرموویەتی:**

(والذي نفس محمد بيده، لا يسمع بي أحد من هذه الأمة يهودي ولا نصراني، ثم يموت ولم يؤمن بالذي أرسلت به إلا كان من أصحاب النار). {صحيح مسلم : ژ153}

(وەرگێڕ: واتا سوێند بەوەی گیانی محمدی بە دەستە، هەرکەسێک لەم ئوممەتە لە یەهودی و نەصرانی ناوی من ببیستێت و پاشان بمرێت و ئیمان بەوە نەهێنێت کە منی پێ نێردراوە ئەوا ئیللا جێگای دۆزەخە).

**ابن حزم (ﷺ) دەڵێ:**

زانایان هاوڕابوونە لەسەر ناولێنانی یەهود و نەصارا بە کافر. {المراتب الإجماع : لا 119}

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة باسی هاوڕابوونی موسڵمانانی کرد لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە یەهود و نەصارا تەکفیر ناکات، کە لە پێشوودا باسمان کرد.**

**جا ئەوەی دەوەستێ لە تەکفیرکردنی یەهود و نەصارا و هاوشێوەکانیان ئەوا بە درۆخەرەوەی ئەم دەقانە و ئەو شتانەی پێشووە کە باسمان کرد، وە موخالیفی ئیجماعی قەطعیە کە پاڵپشتی دەقەکانی قورئان و سوننەت لەگەڵدایە لەسەر کافربوونی یەهود و نەصارا بە تایبەتی، وە هەرکەسێک لەسەر دینی ئیسلام نەبێت بە گشتی.**

***

## **چوارەم:** بەڵگە لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە وەستاوە لە تەکفیرکردنی چەند کەسێکی یان چەند کۆمەڵێکی دیاریکراو، ئەوانەی کە ئیجماع جێگیربووە لەسەر کافربوونیان، وە هێشتا خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام.

**ئەم شێوەیە لەم چەند حاڵەتە تێناپەڕێ:**

1. بوەستێ لە تەکفیرکردنی کۆمەڵێک کە ئیجماع هەیە لەسەر کافربوونیان، چونکە ئەو کوفرە بەڕاست دادەنێت کە ئەوانی لەسەرە، جا ئەو کەسەش لەوانە، ئەویش تەکفیردەکرێت بە ئیجماع.
2. بوەستێ لە تەکفیرکردنی کۆمەڵێک کە ئیجماع هەیە لەسەر کافربوونیان، بەهۆی نەزانینی حاڵی ئەم کۆمەڵەیە یان بەهۆی نەزانینی حوکمی شەرعی دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە، جا ئەم کەسە وەستاوە چەند حاڵەتێکی هەیە:

**یەکەم:** حاڵی کۆمەڵەکە دیار بێت و حوکمی شەرعی دیار بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو لە سەرەتاوە تەکفیر دەکرێت.

**دووەم:** حاڵی کۆمەڵەکە شاراوە بێت و حوکمی شەرعی دیار بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت تاوەکو حاڵی کۆمەڵەکەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە.

**سێیەم:** حاڵی کۆمەڵەکە دیار بێت و حوکمی شەرعی شاراوە بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت تاوەکو حوکمی شەرعی دەربارەی ئەم کۆمەڵەیەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە.

**چوارەم:** حاڵی کۆمەڵە شاراوە بێت و حوکمی شەرعی شاراوە بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت تاوەکو حاڵی کۆمەڵەکە و حوکمی شەرعی دەربارەی کۆمەڵەکەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە.

بە پشتیوانی الله لە بابەتی پێنجەمی ئەم بەشەدا چەند جێبەجێ کردنێکی زانایان باس دەکەین دەربارەی ئەم حاڵەتانە.

وە هۆکاری تەکفیرکردندا لێرەدا بە درۆخستنەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو دەقانەیە کە بەڵگەن لەسەر کافربوونی ئەم کۆمەڵەیە، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ لاَ بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لاَ يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴾

**[المؤمنون : 117]، وە چەندان ئایەتی تر کە بەڵگەن لەسەر جۆرێک لە جۆرەکانی شیرك و کوفر.**

**3. کەسێک لە ئەصڵدا خاوەن عەقیدەیەکی فاسد بێ، پاشان بوەستێ لە تەکفیرکردنی کۆمەڵێک کە ئیجماع هەیە لەسەر کافربوونیان، دان بەوەش دابنێ کە ئەوەی ئەم کۆمەڵەیە لەسەریەتی کوفرە، بەڵام بوەستێ لە تەکفیرکردنیان بە تەئویلێک کە هۆکاری تەئویلەکە بیدعەکەیەتی، جا ئەم کەسە بە درۆخستنەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو دەقانەی لێ نەهاتۆتە دی کە بەڵگەن لەسەر کوفری ئەم کۆمەڵەیە، جا لە تەکفیرکردنی ئەم کەسەدا دوو ووتە هەیە، یەکەمیان: تەکفیر دەکرێت بەهۆی موخالەفەکردنی ئیجماع، دووەمیان: بە فاسق دادەنرێت.**

**لەوانەیە هۆکاری ئەم خیلافە بگەڕێتەوە بۆ ئەو خیلافەی کە هەیە لەسەر تەکفیرکردنی کەسی موخالیف بۆ ئیجماعێک کە دەقی لەسەر نیە، هەروەک لە پێشوودا باسکرا، وە تەکفیر نەکردن لەم حاڵەتەدا لە ئیمام أحمد بن حنبل (رحمه الله) گێڕدراوەتەوە کە ئەمەش یەکێکە لە ڕیوایەتەکان کە لە ئەوەوە دەگێڕدرێتەوە، وە ژمارەیەک لە زانایانی (متأخر)ی مەزهەبی حەنبەلی تەرجیحی ئەم ڕیوایەتە دەکەن، وە هەمان ئەم ڕایە لە ووتەی ئیمام بوخاری (رحمه الله) بەدی دەکرێت.**

**القاضي أبو يعلى الفراء (رحمه الله) دەڵێ:**

خیلاف نیە لە مەزهەبی حەنبەلی دەربارەی تەکفیرکردنی موعتەزیلە لە چەند بابەتێکدا، لەوانە کە دەڵێن: قوڕئان مەخلوقە و نەفی بینینی الله دەکەن لە بەهەشتدا، وە نەفی دروست بوونی کردەوەی بەندەکان دەکەن لەلایەن الله، وە هاوشێوەی ئەمانە، چونکە بەڵگە هەیە لەسەر ئەمانە کە ئێرە شوێنی باسکردنی نیە، جا کەسێک بوەستێ لە تەکفیرکردنیان ئایا کافر دەبێت یان نا ؟

المروذي و يعقوب بن بختان و أبو طالب لە ئیمام ئەحمەدەوە نەقڵ دەکەن کە ووتویەتی: (کافر نابێت)، لە ڕیوایەتی أبو طالب دا ووتویەتی: (هەرکەسێک بڵێ قوڕئان مەخلوقە ئەوا کافرە، وە ئەوەی تەکفیری نەکات کافر نابێت)، وە المروذي نەقڵی کردووە دەربارەی کەسانێک لە (طرسوس) کە تەکفیری ئەو کەسە دەکەن کە کافریان ناکات، ئیمام ئەحمەد دەربارەیان ووتویەتی: (هیچ شتێکم نەبیستووە لەسەر ئەمە)، وادیارە مەزهەبی ئیمام ئەحمەد ئاوا بووە کە تەکفیری جەهمیەکان دەکەن بەڵام ئەو

کەسە تەکفیر ناکەن کە تەکفیریان ناکات، ڕووکەشی ووتەکە وادیارە کە ئەو تەکفیری ئەوانە ناکات کە تەکفیریان ناکەن، بە هەمان شێوە أبو طالب نەقڵی کردووە.

{المسائل العقدية من كتاب الروايتين والوجهين : لا 108}

**المرداوي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ابن حامد لە کتێبەکەیدا (شرح أصول الدين) باسی کافربوونی خەواریج و ڕافیزە و قەدەریيە و موڕجیئەی کردووە، وە ووتویەتی: (هەرکەسێک ئەوانە کافر نەکات کە بە کافرمان داناون ئەوا فاسق دەبێت و هەجر دەکرێت، وە دەربارەی کافربوونیشی دوو ووتە هەیە) ئەوەی ابن حامد و جگە لەویش باسیان کرد لەوانەی لە المروذي و أبو طالب و یعقوب و جگە لەوانیش دەگێڕنەوە کە ئیمام ئەحمەد ووتویەتی: (کافر نابێت).

{الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف : 324/10}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەندێک لە هاوەڵانی ئیمام ئەحمەد دوو ڕیوایەت لەو دەگێڕنەوە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەهلی بیدعە بە ڕەهایی، تاکو موڕجیئەشیان خستۆتە ناویەوە، ئەمەش وانیە، وە هەر لە ئیمام ئەحمەدەوە دوو ڕیوایەت هەیە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە تەکفیری ئەهلی بیدعە ناکات، ئەوەی ڕاسترە ئەوەیە کە تەکفیر ناکرێت، وە لەوانەیە هەندێکیان خیلاف دروست بکەن لە تەکفیرکردنی کەسێک کە تەکفیری ئەهلی بیدعە ناکات بە ڕەهایی، ئەمەش صاف هەڵەیە. {مجموع الفتاوى : 486/12}

(وەرگێڕ: دوای گەڕانەوە بۆ کتێبەکە دەرکەوت مەبەستی ابن تيمية لە ئەهلی بیدعە قەدەریيە و خەواریج و جەهمیە و هەندێک ڕەوافیزە کە ڕەفزەکەیان زۆر نیە، نەوەک هەموو بیدعەیەک).

**عبد السلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەوەی ڕاست بێت ئەوەیە هەموو بیدعەیەک کە کوفر نەبێت کەسی تەقلیدکەرەوە تیایدا بە فاسق دانانرێت بەهۆی شاراوەییەکەی، هەروەک ئەو کەسەی کە (علي) لە هەموو هاوەڵان بە باشتر دادەنێت، وە **دەوەستێت لە تەکفیرکردنی ئەو بیدعەچیانەی کە تەکفیرمان کردوون*** پاشان باسی ڕیوایەتەکەی ابن هانئ و پرسیارەکەی المروذي بۆ باوکی عبد الله (ئیمام ئەحمەد) دەکات کەسانێک هەن ئەوانە تەکفیر دەکەن کە تەکفیریان ناکەن، ئیمام ئەحمەدیش سەرزەنشتی ئەم شتەی کرد،

وە لە ڕیوایەتی أبو طالب دا هاتووە کە ووتویەتی: (کێ جورئەت دەکات بەو کەسە بڵێ کافر، لەکاتێکدا ئەو دەڵێ قورئان مەخلوق نیە !؟).

{نقله المرداوي : الفروع 240/11 ، التحبير 3923/8} (وەرگێڕ: عبدالسلام باپیری ابن تیمیةیە)

*(تێبینی مكتب البحوث والدراسات) : ئەوەی ئەمە حاڵی بێت و تەفسیق نەکرێت جێگای تێڕامانە، وە ڕاستی ئەوەیە کە کەمترین شت فاسیقە و هەجریش دەکرێت هەروەک لە پێشوودا باسکرا.

(مكتب البحوث والدراسات) دەڵێ: ووتەی ئیمام ئەحمەد کە دەڵێ: (کێ جورئەت دەکات بەو کەسە بڵێ کافر، لەکاتێکدا ئەو دەڵێ قورئان مەخلوق نیە !؟)، ئەمە ڕوون دەکاتەوە کە ئیمام ئەحمەد کەسی وەستاو تەکفیر ناکات مادام هاوڕایان نەبووە لەسەر کوفرەکەیان، وە ڕوونی دەکاتەوە کە ووتەیەتی: (هەرکەسێک هەموو ئەم کۆمەڵەیە "جەهمیەکان و ئەوانەشی دەوەستن لە تەکفیرکردنیان" تەکفیرنەکات ئەوا وەکو ئەوانە)، مەبەستی ئەوانەیە کە تەکفیری جەهمیەکان ناکەن و موخالەفەی خۆیان بۆ جەهمیەکان دەرناخەن لەو شتانەی کە جەهمیەکان پێی کافربوونە، بەڵام ئەوەی تەکفیریان نەکات بەڵام موخالەفەی خۆی بۆ جەهمیەکان دەربخات ئەوا ئیمام ئەحمەد تەکفیریان ناکات، والله أعلم.

(وەرگێڕ: ئەم ووتەیەی "مكتب البحوث والدراسات" تەئویل کردنی ووتەکەی ئیمام ئەحمەد نیە بەڵکو جەمع کردنێکی زۆر جوانە لەنێوان هەردوو ئەو ڕیوایەتەی کە هاوەڵانی دەیگێڕنەوە لە ئیمام ئەحمەدەوە، کە لە یەکێکیان تەکفیری ئەو کەسە دەکات کە بوەستێ لە تەکفیرکردنی جەهمیەکان، لەوی تریان تەکفیری ناکات).

## الإمام البخاري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

سەیری ووتەی یەهود و نەصارا و مەجوسم کرد، نەم بینی هیچیان لە کوفرەکانیاندا لە جەهمیەکان گومڕاتر بن، وە من ئەو کەسە بە جاهیل دادەنێم کە تەکفیری جەهمیەکان ناکات، مەگەر کەسێک کوفری جەهمیەکان نەزانێت.

{خلق أفعال العباد : ب 2/ لا 24/ ژ 34}

**لە ووتەکەی ئیمام بوخاری دەردەکەوێت کە ئەو تەکفیری ئەو کەسە ناکات کە وەستاوە لە تەکفیرکردنی جەهمیەکان، هەروەکو یەکێک لە دوو ڕیوایەتەکەی سەر ئیمام ئەحمەد.**

**بەڵگە دەهێندرێتەوە لەسەر تەکفیرکردنی کەسی وەستاوی تەئویلکەر بە چەند فەرموودەیەک:**

**له "ابن عباس"ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(صنفان من أمتي ليس لهما في الإسلام نصيب: المرجئة والقدرية).

{سنن الترمذي : ژماره 2149} وقال: حديث حسن غريب.

{الطبري : تهذيب الآثار، 653/2} دەڵێ: ئەم خەبەرە سەنەدەکەی صەحیحە لەلای ئێمە.

(وەرگێڕ: واتا دوو کۆمەڵ لە ئوممەتی من هیچ بەشێکیان نیە لە ئیسلامدا، ئەوانیش مورجیئە و قەدەرین).

**له "أنس"ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:**

(صنفان من أمتي لا يردان على الحوض، ولا يدخلان الجنة: القدرية والمرجئة).

وفي لفظ: (القدرية والمرجئة مجوس هذه الأمة، فإن مرضوا فلا تعودوهم، وإن ماتوا فلا تشهدوهم). {رواه الطبراني في المعجم الأوسط} ب 4/ لا 281/ ژ 4204-4205

{الهيثمي له مجمع الزوائد : ب 7/ لا 207/ ژ 11889} دەڵێ: ڕاویەکانی سەنەدەکە ڕاوی "بوخاری و موسلیم"ن، تەنها هارون بن موسى نەبێت، ئەویش جێگای متمانەیە (ثقة).

(وەرگێڕ: واتا دوو کۆمەڵ لە ئوممەتی من نایەنە سەرحەوزی کەوثەر، وە ناچنە بەهەشتەوە، ئەوانیش قەدەرییە و مورجیئەن) لە لەفزێکی تردا هاتووە: (قەدەرییە و مورجیئە مەجوسی ئەم ئوممەتەن، گەر نەخۆش کەوتن سەردانیان مەکەن، وە ئەگەر مردن ئامادەی ناشتنیان مەبن).

**له الإمام أحمد بن حنبل (رحمه الله) ڕیوایەت کراوە کە ووتویەتی:**

ئەهلی بیدعە ئەوانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە دینی ئیسلام دەری کردوون بریتین لە: قەدەرییە و مورجیئە و ڕافیزە و جەهمیە، جا ووتی: نوێژیان لەگەڵدا مەکەن، نوێژیان لەسەردا مەکەن. {طبقات الحنابلة : 311/1}

**لە ڕووکەشی ئەم ڕیوایەتەدا دەردەکەوێ کە ئیمام ئەحمەد مورجیئە بە کافر دادەنێت، بەڵام شێخی ئیسلام ابن تیمیة ئینکاری لەسەر ئەو کەسانە دەکات کە ئەم ووتەیە دەگێڕنەوە لە ئیمام ئەحمەدەوە، وە دەڵێ:** (سەلەف و پێشەوایان خیلافیان نەبووە لە تەکفیرنەکردنی مورجیئە و ئەو شیعانەی کە "عەلی" لە هەموو هاوەڵان بە باشتر دەزانن بەبێ تانەدان لە هاوەڵان وە هاوشێوەکانیان، وە خیلاف نیە لە ووتەکانی ئەحمەد کە ئەو تەکفیری ئەمانە ناکات، گەرچی هەندێک لە هاوەڵانی ئەوە دەگێڕنەوە کە ئەو تەکفیری هەموو ئەهلی بیدعەی کردووە ئەمانە و جگە لەمانەش، ئەمەش جێگای خیلافە لەسەر ئیمام ئەحمەد یان لە مەزهەبەکەی،

تەنانەت هەندێکیان بە ڕەهایی دەڵێن ئەمانە و جگە لە مانەش تاهەتایە لە دۆزەخ دەمێننەوە، ئەمەش هەڵەیە بەرامبەر مەزهەبی ئەحمەد، وە هەڵەیە بەرامبەر شەریعەت. {مجموع الفتاوى : 351/3}

**لەم حاڵەتەدا حوکم بەگوێرەی ئەوە دەدرێت کە ئایا کوفری ئەو کۆمەڵەیە یان ئەو کەسە ئاشکرا و دیارە، هەروەک ئەوانەی بت دەپەرستن و بانگەشەی خوایەتی دەکەن بۆ غەیری الله و شوێنی ئەو کەسە دەکەون کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، جا ئەمانە هیچ تەئویل هێنانەوەیەک دەربارەیان قبوڵ ناکرێت، چونکە کوفری ئەمانە و ئەوەشی دەوەستێ لە تەکفیرکردنیان شتێکی زانراوە لە دینی ئیسلامدا بە زەرورەت، ئەگەرچی ئەم کۆمەڵانە خۆشیان بدەنە پاڵ ئیسلام.**

**القاضي عياض (رحمه الله) دەڵێ:**

علي بن أبي طالب (رضي الله عنه) ئەو کەسانەی سوتاند کە بانگەشەی خوایەتی "عەلی"یان دەکرد، وە "عبد الملك بن مروان" الحارث المتنبي کوشت و لە سێدارەیدا، وە چەندە خەلیفە و پاشا شتی ئاوایان کردووە دەربارەی هاوشێوەی ئەو کەسانە، وە زانایانی سەردەمی ئەم خەلیفە و پاشایانە یەکدەنگ بوونە لەسەر ئەوەی کە ئەم کارەی خەلیفە و پاشایان دروستە، وە ئەوەی خیلافی هەبێت لە کافربوونی ئەمانە ئەوا کافرە، وە فەقیهە مالکی مەزهەبەکانی بەغداد لە سەردەمی "المقتدر" وە قازی أبو عمر المالكي یەکدەنگ بوون لەسەر کوشتنی "حەللاج" و لە سێدارەدانی، چونکە بانگەشەی خوایەتی و تێکەڵبوونی زاتی الله ی دەکرد لەگەڵ مەخلوقەکاندا (الحلول)، وە دەیووت "أنا الحق" واتا من خوام لە هەمان کاتدا بە ڕووکەش وا خۆی نیشان دەدا کە دەستی گرتووە بە شەریعەت، وە تەوبەیان لێ قبوڵ نەکرد، وە هەمان حوکمیان بەسەر "ابن أبي العزافير"دا کە لەسەر هاوشێوەی مەزهەبی حەللاج بوو ئەمەشیان لە سەردەمی "الراضي بالله" وە قازی ئەوکاتی بەغداد أبو الحسين بوو کوڕی أبو عمر المالكي.

{الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 297/2}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی کۆمەڵێکی "باطنی" دەڵێ:**

هەرکەسێک بڵێ (تەئویلی ئەوان موافیقی شەریعەتە)، ئەوا ئەو کەسە لە سەرکردە و پێشەوایانی ئەوانە، جا ئەو کەسە گەر زیرەک بێت ئەوا دەزانێت قسەکەی خۆی درۆیە، وە گەر بە ڕووکەشی و پەنهانی ئەمە بیروباوەڕی بێت ئەوا لە نەصاراش کافرترە،

جا هەرکەسێک ئەمانە تەکفیر نەکات و تەئویل بۆ ووتەکانیان بهێنێتەوە، ئەوا بێگومان نەصارا هەر تەکفیر ناکات کە دەڵێن سێ خوا هەیە و یەکیان گرتووە.
{مجموع الفتاوى : 133/2}

**ابن الوزير الصنعاني** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

گومان لەوە دانیە کە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی بت پەرستان یان تەکفیریان نەکات ئەوا واجبە تەکفیر بکرێت، هۆکاری ئەم تەکفیرکردنەش ئەوەیە کە کافربوونی ئەوان شتێکی زانراوە بە زەرورەت لە ئیسلامدا. {الروض الباسم : 509/2}

**نزیک لەم مانایەوە ئەثەرێکی هەڵبەستراو هاتووە کە هیچ ئەصڵی نیە، لەمەی خوارەوەدا باسی دەکەین بۆ ئاگاداربوون لێی:**

**لە (مصعب بن عبد الله بن الزبير) دەگێڕدرێتەوە:** کە ئەو کەسێکی نارد بۆلای هەردوو ژنەکەی **المختار*** دایکی ثابت و عمرة، پرسیاریان لێبکات کەچی دەڵێن دەربارە المختار؟ دایکی ثابت ووتی: ئێوە چی دەڵێن منیش هەر ئەوە دەڵێم، پێیان ووت تۆ بڕۆ، بەڵام عمرة ووتی: ڕەحمەتی خوای لێبێت بەندەیەک بوو لە بەندە چاکەکان، مصعب بردی بۆ بەندیخانە، نامەیەکی بۆ عبد الله بن الزبير نارد ووتی ژنەکەی وا دادەنێت کە المختار پێغەمبەرە، عبد الله نامەیەکی بۆ مصعب نارد ووتی: لە بەندیخانە دەری بێنە و بیکوژە.
{رواه الطبري في تاريخه : 494/3} ، {رواه ابن عساكر في تاريخه : 296/69} ، {رواه البلاذري في أنساب الأشراف : 443/6}

***(المختار بن أبي عبيدة الثقفي درۆزن) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، لەساڵی 67 هـ کوژرا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی فەرموویەتی: (إن في الثقيف كذابا ومبيرا) واتا لە ثەقیف درۆزن و خوێنڕێژ دەردەکەوێت. {صحيح مسلم : ژ6588}، الإمام الذهبي دەڵێ: درۆزنەکە المختار بوو کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد وەحی بۆ دێت و غەیب دەزانێت، خوێنڕێژەکەش الحجاج بوو قبحهما الله. {سير أعلام النبلاء : ب 3/ لا 539/ ژ144}**

***

## پێنجەم: بەڵگە لەسەر تەکفیرکردنی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کەسێک کە کەوتۆتە ناو جۆرێک لە جۆرەکانی کوفری ئیجماع لەسەر.

هەمان حاڵەت و بەڵگەکانی بابەتی پێشوو (چوارەم) بۆ ئەم بابەتە بەکاردێت.

***

# بابەتی سێیەم

## هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کافر

**بەگوێرەی تێڕوانین لە ووتەی زانایان دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە، بە ڕوونی دەردەکەوێت ئەوەی باسیان کرد دەربارەی هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کافر دەگەڕێتەوە بۆ بە درۆخستنەوە و ڕەتکردنەوەی شەرع، نەوەک بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەصلی دین.**

**وە زانایان بە بەردەوامی باسی هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاویان کردووە بەگوێرەی ئەوەی کە کوفر بە ئینکارکردنی حوکمە موتەواتیرە ئیجماع لەسەرەکان ڕوودەدات یان بە ئینکارکردنی شتێکی زانراو لە دین بە زەرورەت ڕوودەدات.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

کوفر ڕوودەدات بە ئینکارکردنی شتێکی زانراو لە دین بە زەرورەت، یان بە ئینکارکردنی حوکمە موتەواتیرەکان و ئیجماع لەسەرەکان و هاوشێوەکانیان ڕوودەدات.

**{مجموع الفتاوى : 106/1}**

**لەمەی خوارەوەدا باسی ووتەی ئەو زانایانە دەکەین کە لەسەری وەستاوین دەربارەی هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کافر:**

1. **القاضي عياض** هۆکاری تەکفیرکردنی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی یەهود و نەصارا و ئەوانەی دینی ئیسلام وازلێدەهێنن دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی: کە دەقی شەرعی و ئیجماع یەکدەنگن لەسەر کوفرەکەیان، جا هەرکەسێک بوەستێ لە تەکفیرکردنیان ئەوا دەقی شەرعی بە درۆخستۆتەوە، یان گومانی تێدا هەیە، وە درۆخستنەوە و گومان لە دەقی شەرعی ڕوونادات ئیللا لای کافر نەبێت. **(القاضي عياض ئەم ووتەیەی لە أبو بكر الباقلاني نەقڵ کردووە). {الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 280/2}**
2. **شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە فیرعەونی تەکفیر نەکردووە دەڵێ:** زەرورەتێکی زانراوە لە هەموو دینەکاندا دینی موسڵمانان و یەهود و نەصارا کە فیرعەون یەکێک بووە لە کافرترین بوونەوەرەکان بە اللە. **{مجموع الفتاوى : 125/2}**

**3. ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ) دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە گومانی هەیە لە کافربوونی بت پەرستێک یان تەکفیری ناکات دەڵێ:**
هۆکاری تەکفیرکردنەی (کەسە گوماندارەکە یان وەستاوەکە) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کوفری کەسی بت پەرست شتێکی زانراوە لە دیندا بە زەرورەت.
{الروض الباسم : 509/2}

**4. البهوتي (رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ) دەربارەی ئەو کەسەی کە تەکفیری ئەوانە ناکات کە لەسەر غەیری دینی ئیسلامن دەڵێ:** ئەو کەسە کافرە چونکە بە درۆخەرەوەی ئەم ووتەی الله تعالى یە: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ [آل عمران : 85]. {كشاف القناع : 170/6}

**5. شێخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُمُ ٱللَّٰهُ)** هۆکاری تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دەڵێ: (هەرکەسێک دوو شایەتمانەکە بهێنێت جائیز نیە تەکفیر بکرێت ئەگەرچی غەیری الله بپەرستێ) دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی: خاوەنی ئەم ووتەیە بە درۆخەرەوەی الله و پێغەمبەرەکەی و ئیجماعی موسڵمانانە. {الدرر السنية : 250/10}

**6. وە هەندێک لە پێشەوایانی بانگەوازی نەجدی دەڵێن:**
ئەوەی موشریکان بە کافر دانەنێت ئەوا باوەڕی بە قورئان نیە، چونکە قورئان موشریکانی بە کافر داناوە، وە فەرمانی کردووە بە تەکفیرکردنیان و دژایەتیکردنیان و شەڕکردن لەگەڵیان. {الدرر السنية : 9/291}

**ئەوەی دەستمان کەوت ئەمەیە: پوختەی ووتەی زانایان دەربارەی هۆکاری تەکفیرکردن لەم هەڵوەشێنەرەوەیەدا بریتیە لە هەبوونی گومان یان بە درۆخستنەوەی حوکمە شەرعیە ئیجماع لەسەرەکان یان ڕەتکردنەوەی شتێکی زانراو لە دین بە زەرورەت، وە ئەوەی پاڵپشتی ئەمە دەکات ووتەی هەریەک لە (ئیمام أبو حاتم الرازي و شێخی ئیسلام ابن تيمية و شێخ سليمان بن عبد الله)یە رَحِمَهُمُ ٱللَّٰهُ، کە لە پێشوودا هێنامان دەربارەی ئەو کەسەی بەهۆی جەهلەکەی دەوەستێ لە تەکفیرکردنی چەند کۆمەڵەیەکی موشریك کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام، ئەوا ئەو کەسە تەکفیر ناکرێت ئیللا دوای فێرکردنی و ڕوون کردنەوە بۆی.**

**أبو الحسين الملطي الشافعي هۆكاری تەكفیركردنی كەسی وەستاو لە تەكفیركردنی كافر بەم شێوەیە لێک دەداتەوە:** چونكە ئەوەی گومانی هەبێت لە كوفر ئەوا ئیمانی نیە، چونكە كوفر و ئیمان لێک جیاناكاتەوە.

{التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع : لا 40}

**ڕوونكردنەوەیەک لەسەر ئەمە:**

**"أبو الحسين الملطي" خودی گومان هەبوون لە كافری نەكردووە بە كوفر، بەڵكو هۆكاری كوفرەكەی گەڕاندۆتەوە بۆ هەبوونی گومان لە خودی كوفرەكە، واتا گومانی هەبووە لە كوفرێک كە كوفر بێت.**

**ڕوونتر: كەسی وەستاو تەكفیر ناكرێت لەبەر ئەوەی گومانی هەبووە لە كافرەكە، بەڵكو تەكفیر دەكرێت بەهۆی ئەوەی گومانی هەبووە ئەم شتەی كافرەكە كردوویەتی كوفر بێت، واتا هۆكارەكەی باوەڕنەبوونە بەو شتەی كە شەرع دایناوە كە كوفرەكەیە.**

**ووتەی البقاعي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **نزیكە لە ووتەكەی "الملطي" كە دەڵێ:**

گومان هەبوون لە كوفر دوای ڕوونكردنەوە، كوفرە.

{تنبيه الغبي إلى تكفير ابن عربي : 197/1}

**وە ووتەی "الملطي" كە دەڵێ: (چونكە كوفر و ئیمان لێک جیاناكاتەوە) وا لێک دەدرێتەوە كە مەبەستی ئەوە بێت: هەركەسێک جیاوازی نەكات لەو شتانەی كە زانینی زەڕوڕەتە لە دیندا لەنێوان بابەتی ئیمان و كوفردا، ئەمەش گومان نیە لە كافربوونی، چونكە ئەم كەسە هیچ نیە جگە لە پشتێكەر لە فێربوونی دینی ئیسلام.**

**شێخ عبد الرحمن بن حسن آل الشيخ** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

كەسێک ئیسلام و كوفر لێک جیانەكاتەوە، چۆن ئیسلامەتی تەواوە !؟.

{الدرر السنية : 383/11}

***

# بابەتی چوارەم

## پلەی تەکفیرکردنی کافر لە دیندا

لەم بابەتەدا ئەوە ڕوون دەکەینەوە کە تەکفیرکردن حوکمێکی صاف شەرعیە هیچ بوار نیە بۆ عەقڵ تیایدا، وە بە هەمان شێوە پلەی ئەم حوکمە شەرعیە ڕوون دەکەینەوە لە دیندا.

لەمیانەی بەدوا داچوون بۆ ووتەی زانایان دەرکەوت کە ئەوپەڕی پلەی تەکفیر پێ دەگات بریتیە لە حوکمە زانراوە زەڕورەکان لە دینی موسڵمانان، وەکو تەکفیرکردنی ئیبلیس و فیرعەون و بانگەشەکەرانی خوایەتی یان پێغەمبەرایەتی و بت پەرستان و یەهود و نەصارا و هەموو ئەوانەی واز لە دینی ئیسلام دەهێنن، ئەمەش لەبەر هەبوونی دەقی موتەواتیر کە ئیجماعی قەطعی لەگەڵدایە لەسەر کافربوونیان، بەڵام تەکفیرکردنی ئەو کۆمەڵە موشریکانەی کە خۆیان داوەتە پاڵ ئیسلام پلەکانی جیایە بەگوێرەی دەرکەوتنی حاڵیان و دەرکەوتنی بەڵگە لەسەر کوفرەکانیان، هەروەک لە بابەتی داهاتوودا باسی دەکەین بە پشتیوانی اللە.

لەمەی خوارەوەدا باسی ئەوە دەکەین کە زانایان ڕەحمەتی اللە یان لێبێت ووتویانە حوکمێکی شەرعیە عەقڵ ناتوانێت بە تەنها بیدات:

1. **القاضي عياض** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

**بەشی: ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە چ ووتەیەک کوفرە، وە چ ووتەیەک تیایدا حوکمدان بە کوفر دەوەستێ یان خیلافی لەسەرە، وە چ ووتەیەک کوفر نیە:**

بزانە لێکۆڵینەوە لەم بەشەدا و ڕوونکردنەوە و ئاشکراکردنی شتە شاراوەکان تیایدا سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شەرع، وە هیچ بوارێک نیە بۆ عەقڵ تیایدا.

**{الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 282/2}**

2. **الشهرستاني** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

تەکفیر حوکمێکی شەرعیە، پێکان (صواب) حوکمێکی عەقڵیە.

**{الملل والنحل : 200/1} بە دەستکارییەوە**

**3. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

تەکفیر حوکمێکی شەرعیە، دەبێتە هۆکاری حەڵاڵ کردنی ماڵ و ڕشتنی خوێن و حوکمدان بە مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ، جا وەکو هەموو حوکمە شەرعیەکانی تر لە شەرعەوە وەردەگیرێت.

{بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة و القرامطة و الباطنية : لا 345}

**4. وەهەر شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

کوفر و فیسق حوکمی شەرعین، لەم حوکمانە نین کە عەقڵ بە تەنها بیان دات، جا کافر ئەوەیە کە الله و پێغەمبەرەکەی بە کافریان داناوە، وە فاسق ئەوەیە کە الله و پێغەمبەرەکەی بە فاسقیان داناوە، هەروەک چۆن ئیماندار و موسڵمان ئەوەیە کە الله و پێغەمبەرەکەی بە ئیماندار و موسڵمانیان داناوە..... وە ئەم بابەتانەش هەموویان جێگیربوونە بە شەرع. {منهاج السنة النبوية : 92/5} بە دەستکارییەوە

**5. وەهەر شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئیمان و کوفر لەو حوکمانەن کە بە وەحی الله چەسپاون، وە بە بەڵگەی شەرعی ئیماندار و کافر لێک جیادەکرێنەوە، نەوەک تەنها بە بەڵگەی عەقڵی.

{مجموع الفتاوى : 328/3}

**6. عەللامە ابن القيم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

| | | |
|---|---|---|
| الكفــر حـق الله ثـم رسـولــه | *** | بالنص يثبت لا بقـول فـلان |
| مـن كـان رب العالميـن وعبده | *** | قد كفراه فذاك ذو الكفران |

{الكافية الشافية (نونية) : لا 858}

**(وەرگێڕ: واتا تەکفیرکردن حەقی الله یە پاشان پێغەمبەرەکەی، بە دەقی شەرعی جێگیر دەبێت نەوەک بە ووتەی فلان، هەرکەسێک پەروەردگاری جیهانیان و بەندەکەی (محمد) تەکفیریان کردبێت، ئەوا ئەو کەسە کافرە).**

**7. ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

بەڵگە لەسەر کوفر و فیسق ئیللا دەبێت بە دەقێکی قطعية الدلالة بێت، وە خیلافیش نیە لەم شتەدا. {العواصم والقواصم : 179/4}

**(وەرگێڕ: بڕوانە ڕوونکردنەوەی قطعية الدلالة کە لە پێشوودا باسمان کرد).**

**8. تقي الدين السبكي** (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

تەکفیر حوکمێکی شەرعیە، هۆکارەکەی ئینکارکردنی ڕوبیەتە یان تاک و تەنهایی الله یە یان وەحیە، یان ووتەیەکە یان کردارێکە کە شەرع دانەر بە کوفری داناوە ئەگەرچی ئینکاریش نەبێت. {فتاوی السبکي : 586/2}

**وە زیادکردن لەسەر ئەمە دەڵێین:**

**جا هەرکەسێک حوکمی شەرع نەزانێت دەربارەی کافرێک یان موشریکان یان یەکێک لە کۆمەڵەکان وەکو ئەو کەسە نیە کە تەوحید نەزانێت، بەڵکو حوکمی وەکو ئەو کەسە وایە کە حوکمێک یان واجبێک لە واجبەکانی ئیسلام نازانێت، جا هەرکەسێک ئیقامەی حوججەی لەسەر بکرێت کافر دەبێت، وە هەرکەسێک بەڵگەی پێ نەگات لەسەر ئەمە ئەوا کافر نابێت، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە تەوحید نازانێت ئەو کەسێکی کافرە کوفری جەهلی هەیە.**

**الإمام محمد بن نصر المروزي لە کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی سوننە "أهل الحديث" نەقڵ دەکات کە ووتویانە:**

کاتێک ناسینی الله ئیمان بێت و نەناسینی الله کوفر بێت، وە ئەنجامدانی واجبەکان ئیمان بێت و نەزانینی واجبەکان پێش دابەزینیان کوفر نەبێت، وە **پاش دابەزینیشی ئەوەی ئەنجامی نەدات کوفر نیە*** چونکە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەتا کە الله پێغەمبەرەکەی نارد (ﷺ) باوەڕیان بە الله هێنا و ئەو واجبانەیان ئەنجام نەدابوو کە پاشان لەسەریان واجب کرا، جا نەزانینیان دەربارەی ئەم واجبانە کوفر نەبوو، پاشان الله ئەم واجبانەی بەسەر دابەزاندن، جا باوەڕبوونیان بەم واجبانە و ئەنجامدانی ئیمان بوو، بەڵام ئەو کەسە کافر دەبێت کە ئینکاری ئەم واجبانە بکات بەهۆی بە درۆخستنەوەی وەحی الله، وە ئەگەر وەحی لەلایەن الله وە نەهاتبوایە ئەوا بە نەزانینی کافر نەدەبوون، وە دوای هاتنی وەحیش هەرکەسێک لە موسڵمانان هەواڵەکەی نەبیستبێت بە نەزانینی کافر نابێت، بەڵام نەناسینی الله لە هەموو حاڵێکدا کوفرە پێش وەحی و دوای وەحیش.

{تعظيم القدر الصلاة : 520/2}

* **(تێبینی مکتب البحوث والدراسات) : ئەم ووتەیە نوێژ ناگرێتەوە، ئەوەی واز لە نوێژ بهێنێت کافر و مورتەد دەبێتەوە، ئەگەرچی دان بە واجب بوونیشی بنێت.**

بەڵگە دەهێندرێتە لەسەر جیاوازی کردن لە نێوان نەزانینی تەوحید و نەزانینی حوکمی شەرعی بە چەند بەڵگەیەک، لەمانە:

1. هەموو پێغەمبەران (عليهم السلام) سەرەتا دەستیان کرد بە بانگەوازی قەومەکانیان بۆ بەندایەتی الله بە تەنها بەبێ هاوەڵدانان بۆی، ئەگەر نەزانینی حوکمەکانی تەکفیر کوفر بێت ئەوا بۆ یەک ساتیش ڕوونکردنەوەی ئەمەیان دوا نەخست لەگەڵ ئەصلی دین (تەوحید) ڕوونیان دەکردەوە، هەروەک ووشەی تەوحید کە (لا إله إلا الله)یە بەڵگە نیە لەسەر تەکفیر تەنها بەشێوەی لێکەوت نەبێ ئەمەش نابێتە حوجە، چونکە ئەمە بەڵگەیە لەسەر شتێک کە لە دەرەوەی ماهیەتی (لا إله إلا الله)یە، وە بە هەمان شێوە تەکفیر لە دەرەوەی ماهیەتی ئەو (تەوحید)یە کە بە عەقڵ و فیطرەت هەستی پێ دەکرێت، وە تەکفیر لەناو بازنەی ئەو شتانە دایە کە تەنها بە شەرع جێگیردەبن.

(وەرگێڕ: لێرەدا بە پێویستی دەزانین ڕوونکردنەوە لەسەر چەند دەستەواژەیەکی (علم المنطق) بدەین کە لەلایەن زانایانی أصولیش بەکاردێت بۆ بەڵگە هێنانەوە، چونکە ئەم دەستەواژانە لەم ووتەیەی سەرەوەدا بەکارهاتووە، وە لە ووتەی (أبو حامد الغزالي)ش هاتووە کە دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دێینە سەری).

الماهية: ئەم دەستەواژەیە لە دوو ووشە پێکهاتووە ئەوانیش (ما) و (هي) کە لێکدراون و بۆتە (الماهية) کە دەڵێن ماهیەتی ئەم شتە چیە ؟ واتا حەقیقەتی ئەم شتە چیە ؟ بۆ نموونە گەر بڵێن ماهیەتی مۆبایل چیە واتا حەقیقەتی مۆبایل چیە ؟ دەڵێن بۆ قسەکردن بەکاردێت، واتا قسە پێکردن ماهیەتی مۆبایلە، بەڵام بەکارهێنانەکانی تری مۆبایل وەکو ئەتاری پێکردن و حیسابات و سەیری کردنی ڤیدیۆ و گوێگرتنی قورئان و ...هتد ئامانە ماهیەتی مۆبایل نین، بەڵکو لە لێکەوتەکانی مۆبایلن، بۆیە کە باسی مۆبایل دەکرێت دەست بەجێ مێشکمان بۆ تەلەفۆن و قسەپێکردن دەچێت، ئەگەرچی ئەتاری و کۆمەڵێک شتی تر لەناو مۆبایلدا هەن، بەڵام ئەوان ماهیەتی مۆبایل نین، بەڵکو بریتین لە لێکەوتەکانی مۆبایل واتا (الإلتزامات).

الدلالة – بەڵگە: ئەو شتەیە کە بەڵگەیە دەلالەت لە شتێکی تر دەکات، بۆ نموونە کە لە دەرگا دەدرێت ئەمە بەڵگەیە دەلالەتە لەسەر ئەوەی کەسێک لە پشت دەرگایە.

الدلالة – بەڵگە کراوە بە سێ جۆر: عقلية و طبيعية و وضعية، هەر یەکێک لەم سێیە دەبێتە دوو جۆر: لفظية و غير لفظية، ئەوەی لێرە بابەتەکەی ئێمەی لەسەر بەندە و باسی دەکەین بریتیە لە الدلالة الوضعية اللفظية، ئەمەشیان دەبێتە سێ جۆر: مطابقية و تضمنية و إلتزامية، لێرەدا ئەوەی ئێمە باسی دەکەین ئەم سێ جۆرەیە:

**1. دلالة المطابقة – بەڵگەی هاوتا:** واتا ئەو ووشەیەی کە بەڵگەیە بۆ شتێک خودی ووشەکە و ئەو مانایەی کە ووشەکە دەیدات هاوتا (مطابق)ی یەکترن، بۆ نموونە:

ووشەی (ئافرەت) بەڵگەیە دەلالەتە لەسەر (ڕەگەزی مێ)، ووشەکە کە (ئافرەت)ە هاوتایە لەگەڵ ئەو مانایەی کە بە مێشکمان دادێت کە (ڕەگەزی مێ)ە.

ئەم جۆرە بەڵگەیە ئیعتیباری هەیە بۆ ئەوەی ببێتە حوججە چونکە کەس ئینکاری ئەمە ناکات کە ئافرەت هاوتای ڕەگەزی مێیە.

**2. دلالة التضمن – بەڵگەی لەخۆگرتن:** واتا ئەو ووشەیەی کە بەڵگەیە بۆ شتێک مانای شتەکە لە چوارچێوەی ووشەکە دایە، واتا خودی ووشەکە ئەم مانایەی لە خۆگرتووە، بۆ نموونە: ووشەی (ئافرەت) بەڵگەیە دەلالەتە لەسەر (کچ)، ووشەکە کە (ئافرەت)ە یەکێک لەو مانایانەی لە خۆگرتووە کە بە مێشکمان دادێت کە (کچ)ە، واتا (کچ) یەکێکە لەو مانایانەی کە ووشەی (ئافرەت) دەلالەتی لەسەردەکات، چونکە ووشەی ئافرەت تەنها مانای (کچ)ی لەخۆنەگرتووە بەڵکو مانای (ژن)یش لەخۆدەگرێت.

ئەم جۆرە بەڵگەیەش ئیعتیباری هەیە بۆ ئەوەی ببێتە حوججە، چونکە کەس ئینکاری ئەمە ناکات کە ووشەی ئافرەت کچیشی لەخۆگرتووە.

**3. دلالة الإلتزام – بەڵگەی لێکەوت:** واتا ئەو ووشەیەی کە بەڵگەیە بۆ شتێک خودی ووشەکە بەڵگە نیە لەسەر ئەو مانایەی کە لێی دەکەوێتەوە، بەڵکو وەکو عادەت بە مێشکمان دادێت کە ئەم ووشەیە ئەم مانایەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام خودی ووشەکە بەڵگە نیە لەسەر ماناکە بۆ نموونە: ووشەی (ئافرەت) کە دەبیستین دەست بەجێ لە مێشکمان بۆ ئەوە دەچێت کە کەسێکی نەرم و نیانە و هەست ناسکە، واتا ووشەی ئافرەت هیچ پەیوەندییەکی بە مانای نەرم و نیانی و هەست ناسکیەوە نیە بەڵکو تەنها یەکێک لە لێکەوتەکانی ووشەی (ئافرەت) بریتیە لە نەرم و نیانی و هەست ناسکی.

ئەم جۆرە بەڵگەیە ئیعتیباری نیە بۆ ئەوەی ببێتە حوججە، چونکە لەوانەیە ئافرەت هەبێت نەرم و نیان و هەست ناسک نەبێت، سەرەڕای ئەمەش گەر پشت بە (بەڵگەی لێکەوت) ببەستین ئەوا دەبێت بڵێین ووشەی ئافرەت بەڵگەیە لەسەر هەموو ئەو سیفاتانەی کە ئافرەتی پێ ناسراوە، واتا ووشەی ئافرەت ژمارەیەک مانا دەدات کە ناتواندرێ بژمێردرێ.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ووشەی (لا إله إلا الله) بەڵگەیە لەسەر تەکفیرکردن بەڵام لە جۆری سێیەم نەوەک جۆری یەکەم و دووەم، چونکە ووشەی (لا إله إلا الله) هاوتا و مانا نیە بۆ ووشەی (تەکفیر)، بەڵکو یەکێک لە لێکەوتەکانی (لا إله إلا الله) بریتیە لە تەکفیرکردنی کافران، ئەمەش مانای سڕکردن و لابردنی حوکمی تەکفیرنیە بەڵکو بۆ زەبت کردنی حوکمی تەکفیرە بەشێوەیەکی شەرعی بەبێ زیادەڕەوی و کەمتەرخەمی.

**أبو حامد الغزالي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

ئەوەی جێگای ئیعتیبارە لە پێناسەی ووشەکاندا بریتیە لە بەڵگەی هاوتا و لەخۆگرتن، بەڵام بەڵگەی لێکەوت جێگای ئیعتیبار نیە، چونکە مانای ئەم لێکەوتە لە خودی ووشەکەدا نیە، بە پێچەوانەی بەڵگەی هاوتا و لەخۆگرتن کە مانای ووشەکە دەدەن، وە چونکە هەرووشەیەک کۆمەڵێک لێکەوتی لێ دەبێتەوە کە سنووری نیە و ناژمێدرێ، چونکە لێکەوتی شتێک و لێکەوتی لێکەوتەکانی نە ضبط دەکرێت و نە حصر دەکرێت، ئەمەش وادەکات ووشەیەک بەڵگە بێت بۆ کۆمەڵێک مانا کە کۆتایی نایەت، ئەمەش مەحاڵە. {معيار العلم في فن المنطق : لا 72}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

ماهیەت (حەقیقەت)ی شتێک کە کەسی قسەکەر دەری دەبڕێت بە ووشەیەک، ووشەکە بەڵگەیە لەسەر بەڵگەی هاوتا، وە بەڵگەیە لەسەر ئەو شتەی کە ووشەکە لەخۆی گرتووە بەشێوەی بەڵگەی لەخۆگرتن، وە بەڵگەیە لەسەر لێکەوتەکان کە لە دەوەرەی ماهیەتی ووشەکەن بەشێوەی بەڵگەی لێکەوت.

{منهاج السنة النبوية : 453/5}

**2. جێگیربووە (واتا صەحیحە) لە هاوەڵانەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) کە هەندێکیان وەستاون لە تەکفیرکردنی کەسانێک کە مورتەد بوونەتەوە کەچی هاوەڵان بە موسڵمانیان داناون، وەکاتێک ئایەت دابەزی کافربوونی ئەو کەسانەی ڕوونکردەوە، هاوەڵان داوای استتابەیان لێنەکرا بەهۆی وەستانیان لە تەکفیرکردن، وە جێگیربووە کە یەکێک لە هاوەڵان کەوتۆتە ناو شیرکەوە بە زانینی کەچی هاوەڵان تەکفیریان کرد، وە پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی پێکرد ئیسلامەکەی نوێ بکاتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو کەسەی تەوحید نازانێت وە ئەو کەسەی حوکمی شەریعەت نازانێت.**

**لە "ابن عباس"ەوە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێ:**

کەسانێک لە خەڵکی مەککە موسڵمان ببون موسڵمان بوونیان شاردبوویەوە، جا موشریکان لە جەنگی بەرد لەگەڵ خۆیانیاندا بردن، جا هەندێکیان بریندار بوون و هەندێکیان کوژران، موسڵمانان ووتیان: ئەمانە موسڵمان بوون بەزۆر هێنرابوون

داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن، جا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴾ [النساء :97]، جا ئەوەی لە موسڵماناندا مابوویەوە ئەو ئایەتەی بۆ ناردم کە عوزریان نیە، ئینجا دەرچوون بەرەو مەدینە و موشریکان بەدوایان کەوتن و ئازاریان دان و توشی فیتنەیان کردن، جا ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ ... ﴾ [العنكبوت : 10].

{رواه الطبري في تفسيره - بسند صحيح : 102/9}

(وەرگێڕ: مەبەست لە هێنانی ئەم ئەثەرەی "ابن عباس" ئەوەیە کە ئەوانەی بە زۆر هێنرابوون بۆ جەنگ و کوژران بە کافری مردن و جێگایان دۆزەخە هەروەک لە ئایەتەکەدا هاتووە، کەچی هەندێک لە هاوەڵان وایانزانی ئەوان هەر موسڵمانن، جا تەکفیرنەکردنی ئەم کەسانە نەبووە هۆی کافربوونی هاوەڵان یان داوای استتابةیان لێ بکرێت).

### شێخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب (رحمه الله) دەڵێ:

الله ئەم ئایەتەی دابەزاند (النساء : 97) تیایدا حوکمی ئەم موشریکانەی ڕوونکردەوە کە ئەوان ئەهلی دۆزەخن، سەرەڕای ووتنی شایەتمانی ئیسلام. {الدرر السنية : 241/10}

### لە "سعد بن أبي وقاص"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ:

ئێمە باسی هەندێک شتمان دەکرد، وە من تازە موسڵمان ببوم جا سوێندم بە "لات و عوززا" خوارد هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێیان ووتم: شتێکی زۆر خراپت ووت، بڕۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی پێ بڵێ، چونکە ئێمە وایدەبینین تۆ کافر بوویت، جا منیش بینیم و پێم ووت، ئەویش فەرمووی: (قل لا إله إلا الله وحده لا شريك له ثلاث مرات وتعوذ بالله من الشيطان ثلاث مرات واتفل عن يسارك ثلاث مرات ولا تعد له).

{رواه النسائي في سننه : ژ 3776} ، وصححه البزار و ابن حبان

وقال ابن حجر: أخرجه النسائي بسند قوي {فتح الباري : 11/92}

(وەرگێڕ: واتا سێ جار بڵێ: لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وە سێ جار بڵێ: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم، وە سێ تف بکە بەلای چەپتدا، وە جارێکی تر ئەم سوێندە مەخۆ).

### الخطابي (رحمه الله) دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:

ووتنی (لا إله إلا الله)ی واجب کرد لەسەر ئەو کەسەی کە سوێند بە لات و عوززا دەخوات بەهۆی ترسان لەوەی توشی کوفر بووبێت، چونکە سوێند بەو پەرستراوە

دەخورێت کە بە گەورە دادەنرێت، جا گەر سوێند بخوات بە لات و عوززا ئاوا هاوشێوەی کافرانی کردووە لەمەدا، وە فرمانی پێکرا ووشەی (تەوحید)ی لەدوادا بڵێ کە پاککەرەوەیە لە شیرك. {أعلام الحديث : 1918/3}

**ابن العربي المالكي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

هەرکەسێک لە ئیسلامدا لە سوێند خواردنیدا بڵێ: بە لات و عوززا، ئەم سوێندەی بۆ تەئکیدکردنەوە بێت لەسەر گەورەیی لات و عوززا، ئەوا بەڕاستی کافر بووە.

{عارضة الأحوذي : 28/1}

**ابن الوزير الصنعاني** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:**

ئەمەش فرمان پێکردن بوو بە نوێکردنەوەی ئیسلام (ئیمان).

{إيثار الحق على الخلق : لا 380}

**الإمام الشوكاني** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:**

تیایدایە کە هەرکەسێک سوێندی بە لات و عوززا خوارد با ووشەی شایەتمان بهێنێت، ئەمەش بەڵگەیە کە بەم سوێند خواردنە کافر بووە. {نيل الأوطار : 107/8}

**الأمير الصنعاني** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:**

ئەمەش بەڵگەیە کە مورتەد بوویەوە بە سوێند خواردنی بە بپ، جا پێغەمبەر فرمانی پێکرد ئیسلامی (ئیمانی) نوێکاتەوە چونکە بەم سوێندەی کافر بوو، هەروەک باسمان کردووە لە کتێبی (سبل السلام شرح بلوغ المرام) وە لە کتێبی (منحة الغفار).

{تطهير الإعتقاد من أدران الإلحاد : لا 70}

**شێخ سليمان بن عبد الله** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **ووتەی هەندێک لە زانایانی نەقڵ کردووە کە دەڵێن:** بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی پێکرد کە ئیسلامی (ئیمانی) نوێکاتەوە بە ووتنی (لا إله إلا الله)، جا گەر ئەمە کوفر نەبوایە و لە دین دەری نەکردبوایە ئەوا فرمانی ئەمەی پێ نەدەکرد. {تيسير العزيز الحميد : لا 529}

**وە هەندێک لە زانایان بۆ ئەوە دەچن کە سوێند خواردن بە لات و عوززا شیرکی گەورە نیە بەڵکو شیرکی بچووکە، وە ئەوەی دەردەکەوێ ئەوەیە کە سوێند خواردن بە طاغوتان شیرکی گەورەیە کوفر بە طاغوت هەڵدەوەشێنێتەوە، بە پێچەوانەی ئەو شتانەی کە ڕێزیان هەیە لە شەرعدا و سوێندیان پێ دەخورێ، وەکو کەعبە و باوک و باپیران ئەمە دژی توحیدە بەڵام هەڵیناوەشێنێتەوە، وە هەندێک لە زانایان**

دەڵێن ئەم سوێند خواردنەی سعد (ﷺ) بە هەڵەبوو نەوەک بە مەبەست بۆیە کافر نەبوو بەم سوێند خواردنەی.

بەهەرحاڵ گەر سعد (ﷺ) کەوتبێتە ناو شیرکی بچووکەوە یان بە هەڵە ئەم سوێندەی خواردبێ پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی پێکرد بە نوێکردنەوەی ئیمانەکەی بە ووتنی (لا إله إلا الله) وە فرمانی پێکرد جارێکی تر ئەم سوێندە نەخوات سەرەڕای ئەوەی (سعد) نەزان بوو، جا لەپێشترە تەکفیری ئەو کەسە بکرێت کە دەکەوێتە ناو شیرکی گەورەی ئیجماع لەسەر، وە عوزر نەهێنانەوە بۆی بە جەهل، چونکە لەسەرقسەی ئەوزانایانەی کە دەڵێن سوێند خواردن بە طاغوتان شیرکی گەورەیە ئەوا ڕووکەشی فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عوزر بە جەهل نیە لە شیرکی گەورەدا.

وە لەسەر قسەی ئەو زانایانەی کە دەڵێن سوێند خواردن بە طاغوتان شیرکی بچووکە، ئەوا فەرموودەکە بەڵگەیەکی ڕوونترە لەسەر ئەوەی کە عوزر نیە بە جەهل لە شیرکی گەورەدا، ئەمەش ئەم ڕەئیە بەهێز دەکات کە دەڵێ: شیرکی بچووک لە خاوەنەکەی خۆش نابێت* ئەگەرچی لە دینیش دەری نەکات وە سەرەڕای ئەمەش عوزر بە جەهلی نیە تیایدا بەگوێرەی ئەو مانایەی لە فەرموودەکە دەکەوێتەوە.

*(وەرگێڕ: گەر تەوبەی لێ نەکات).

(وەرگێڕ: پوختەی ووتەکە ئەمەیە گەر ئەوەی "سعد" ووتی شیرکی بچووک بێت و عوزری نەبێت بە جەهل، ئەوا لەپێشترە لە شیرکی گەورەدا عوزر بە جەهل نەبێت، وە ئەگەر ئەوەی "سعد" کردی شیرکی گەورە بێت ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عوزر بە جەهل نیە لە شیرکی گەورەدا).

### شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەڵێ:

دەووترێ هیچ شتێک لە شیرکدا لێخۆشبوونی نیە چ گەورە چ بچووک بەگوێرەی مانا گشتیەکانی قورئان، وە هەرچەندە خاوەنی شیرکی بچووک بە موسڵمانی دەمرێت بەڵام لە شیرکەکەی خۆش نابێت بەڵکو سزا دەدرێت لەسەری، هەرچەندە دوای ئەمەش بچێتە بەهەشتەوە. {مختصر الإستغاثة : 301/1}

**3. ئەوەی هاتووە دەربارەی خیلافی هاوەڵان (ﷺ) لەسەر تەکفیرکردنی هەندێک لە مورتەدان، هەروەک لە ووتەی الله تعالى دا هاتووە: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾** [النساء : 88]، **واتا: (ئەمە چیتانە بۆ دەربارەی مونافیقانەوە بوونەتە دوو کۆمەڵە هەندێکتان تەکفیریان دەکەن و هەندێکتان نایکەن). جا کاتێک الله تعالى کوفری ئەو مونافیقانەی ڕوونکردەوە هیچ یەکێک لەو هاوەڵانەی کە وەستابوون لە تەکفیرکردنیان فرمانیان پێ نەکرا ئیمانەکەیان نوێ بکەنەوە.**

**بە پشتیوانی الله ئەوەی ڕیوایەت کراوە دەربارەی ئەمە لە بابەتی داهاتوودا دەیهێنین.**

**4. ئەوەی هاتووە دەربارەی وەستانی عمر بن الخطاب (ﷺ) لە تەکفیرکردنی زەکات نەدەران لە سەرەتادا، پاشان کە أبو بکر (ﷺ) کوفری ئەوانی بۆ ڕوونکردەوە ئەوکات بووە هاوڕای أبو بکر، کەچی أبو بکر داوای استتابەی لە عمر نەکرد بەهۆی وەستانی لە تەکفیرکردنیان.**

**بە پشتیوانی الله ئەوەی ڕیوایەت کراوە دەربارەی ئەمە لە بابەتی داهاتوودا دەیهێنین.**

**هەندێک لە پێشەوایانی سەلەف لە سەرەتادا کوفری ئەوانەیان نەدەزانی کە دەیان ووت: قورئان مەخلوقە، وە هەیان بوو لە سەرەتادا کوفری جەهمیەکانی نەدەزانی سەرەڕای توندی کوفرەکەیان، جا بەمە کافر نەبوون، وە کاتێک بەڵگەیان بۆ ڕوون بوویەوە لەسەر کوفری ئەمانە نەوەستان لە تەکفیرکردنیان، وە ئیمانەکەیان نوێ نەکردەوە بەهۆی ئەوەی پێشتر وەستابوون لە تەکفیرکردنیان.**

### یعقوب بن إبراهيم الدورقي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

پرسیارم لە (أحمد بن حنبل) کرد دەربارەی ئەوانەی دەڵێن: قورئان مەخلوقە، ووتی: لە سەرەتادا تەکفیرم نەدەکردن تاوەکو چەند ئایەتێکم لە قورئاندا خوێندەوە: ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ [البقرة : 145]، ﴿بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ﴾ [البقرة : 120]، ﴿أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ﴾ [النساء : 166].

**{ابن أبي يعلى : طبقات الحنابلة} 414/1، لەکتێبی (السنة-الخلال)نەقڵی کردووە بسند جيد.**

### ابن عمار الموصلي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

(علي ابن المديني) پێی دەووتم: چ شتێک ڕێگرتە لەوەی جەهمیەکان تەکفیر بکەیت، چونکە من لە سەرەتادا تەکفیریانم نەدەکرد تاوەکو (علي ابن المديني) چەند شتێکی پێ ووتم، جا کاتێک علي وەڵامی داواکەی (مەئمونی) دایەوە ووتی قورئان مەخلوقە،

نامەیەکم بۆی نارد یادی خوام بیرخستەوە، وە قسەکانیم بیرخستەوە کە پێی ووتم دەربارەی تەکفیرکردنیان. {رواه الخطيب البغدادي في تاريخ بغداد - بسند صحيح} 421/13

**(وەرگێڕ: لە سەردەمی مەئمون – خەلیفەی عەباسی، کۆمەڵێک زانای موعتەزیلە دەوریان لێی دابوو قەناعەتیان پێ هێنابوو کە قورئان مەخلوقە، ئەمەش وای لە مەئمون کرد زۆر لە هەموو زانایانی سەردەمی خۆی بکات کە بڵێن قورئان مەخلوقە، ئەوەی وانەڵێت یان زۆر ئازاری دەدا یان دەیکوشت، بۆیە زۆرێک لە زانایان لە ترسی گیانیان لەژێر إکراهدا ووتیان قورئان مەخلوقە، ئیمام ئەحمەدی لێ دەرچێت کە بووە ئیمامی ئەهلی سوننە لەم ڕووداوەدا، ئەم ڕووداوەش ناسراوە بە (المحنة) کە "علي ابن المديني"ش یەکێک بوو لەوانەی لە ژێر إکراهدا ووتی مەخلوقە، وە موعتەزیلە لەمەدا لاسایی جەهمیەکانیان کردەوە کە ووتیان قورئان مەخلوقە).**

**ئاماژە بەوە دەدەین کە زانایان باسیان کردووە لەوەی جەهمیەکان تێیکەوتوون لە نەفی کردنی (تعطيل) صیفاتەکانی الله ئەصلی دین هەڵدەوەشێنێتەوە، وە لەمەدا عوزریان نیە نە بە جەهل نە بە تەئویل، وە کوفرەکەیان توندترە لە شیرکی بت پەرستان و ڕۆژ و مانگ پەرستان، ئەگەرچی کوفری ئەمانە دیارترە لە هی جەهمیەکان.**

**الإمام الطبري** (رحمه الله) دەڵێ:

لەلای ئێمە هیچ کەسێک ئیمانی دانامەزرێت و کوفری لەسەر لاناچێت ئیللا بە زانینی ئەو شتانەی کە باسمان کرد لە پێشوودا، وە ئەوەی باسمان کرد لە صیفاتەکانی الله (تعالى ذكره) وەکو صیفەتی (عیلم و قودرەت و کەلام) هیچ کەسێک عوزری نەزانینی ئەم صیفەتانەی نیە کە گەیشتبێتە بالغ بوون، جا ئەو کەسە الله (تعالى ذكره) پێغەمبەری بۆ ناردبێت یان نا، وە ئەو کەسە کەسی تری بینیبێت جگە لەخۆی یان نەی بینیبێت. {التبصير في معالم الدين : لا 132}

**(وەرگێڕ: مەبەستی ئەوەیە ئەم صیفاتانە بە عەقڵ دەزاندرێ بەبێ وەحی کە الله عیلمی هەیە و قودرەتی هەیە و قسەش دەکات، جا ئەوەی بالغ بێت و ئەمانە نەزانێت ئەوا کافرە جا پێغەمبەری پێ گەیشتبێت یان نا، وە تێکەڵاوی هەبێت لەگەڵ خەڵکی یان تەنها خۆی لە شوێنێکدا بژیت، بەڵام لە حوکمی قیامەتی بەسەردا نادەین ئەگەر هیچ ئیقامە حوججەیەکی لەسەر نەکرابێت).**

**عەللامە ابن القيم** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

شیرکی بت پەرستان و ڕۆژو مانگ و هەسارە پەرستان زۆر چاکترە لە تەوحیدی ئەمانە (جەهمیەکان)* چونکە شیرکی ئەمانە لە بەندایەتیکردن دایە بەڵام دان بەوە دەنێت کە الله دروستکەری گەردوونە وە دان دەنێن بە صیفاتەکانی و کردەوەکانی و قودرەتی و ویستی و عیلمی بە تەواوی شتەکان و ووردەکارییەکان، بەڵام تەوحیدی ئەمانە (جەهمیەکان) بریتیە لە نەفیکردنی ڕوبیەت و ئولوهیەت و هەموو صیفاتەکانی، وە ئەم جۆرە تەوحیدە گەورەترین جۆری شیرکی لێدەکەوێتەوە، هەر بۆیە کەسێک چەندە نەفیکردنەکەی گەورەتر بێ ئەوا شیرکەکەی گەورەتر دەبێ.

{مختصر الصواعق المرسلة : لا 186}

*(وەرگێڕ: بڵێین "تەوحیدی جەهمیەکان لە شیرکی بت پەرستان خراپترە" دەربڕینێکی جوانترە لەوەی کە بڵێین "شیرکی بت پەرستان زۆر چاکترە لە تەوحیدی جەهمیەکان"، چونکە هەردووکیان کوفرن و ناشرین و خراپن، بۆیە هەندێک زانا دەڵێن: دروست نیە بڵێی نەصارا لە یەهود باشترە، بەڵکو دەبێ بڵێی یەهود لە نەصارا خراپترە، والله أعلم).

**ئەوانەی وادەزانن تەکفیر لە ئەصلی دینە کە بە زەروڕەتی عەقڵ و فیطرەت دەزاندرێ، پەیوەست بوونە بەچەند گومانێکەوە کە هەندێکی باس دەکەین:**

## گومانی یەکەم:

**ئەوەی شێخ محمد بن عبد الوهاب** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **باسیکردووە:**

ئەصلی دین و بنچینەکەی بریتیە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی واز لە تەوحید دەهێنێت و شیرك ئەنجام دەدات.

**شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین و بنچینەکەی دوو شتە:**

**یەکەم:** فرمان کردن بە بەندایەتی الله بە تەنها بەبێ هاوەڵ، وە هاندان لەسەر ئەمە، وە پشتیوانی و دۆستایەتی (موالاة) لەپێناویدا، وە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە تەرکی دەکات.

**دووەم:** ئاگادارکردنەوە لە هاوەڵدانان بۆ الله لە بەندایەتیکردن، وە توندبوون لەمەدا، وە دژایەتیکردن (معاداة) لەپێناویدا، وە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە تەرکی دەکات.

{موسوعة المؤلفات الإمام محمد بن عبد الوهاب : 1/12} نامەی (الواجبات المتحتمات)

(وەرگێڕ: پێش ئەوەی بچینە سەر وەڵامدانەوەی ئەم گومانە بەپێویستی دەزانین ڕوونکردنەوە لەسەر چەند دەستەواژەیەکی (علم المنطق) بدەین کە دێتە پێشمانەوە بۆ ئەوەی لێیان تێ بگەین).

**الحد الحقيقي – الحد الرسمي – الحد اللفظي**

هەر یەکێک لە حەددی (حەقیقی و ڕەسمی) دوو جۆری هەیە (تام و ناقص) تەواو و ناتەواو ئێمە به کورتی باسی جۆرەکانیان دەکەین تەنها بۆ تێگەیشتنی ئەو ووتانەی کە دێنە پێشمان.

**الحد الحقيقي التام:** گەر لێت بپرسن مرۆڤ چیە ؟ تۆش بڵێێ: گیانلەبەرێکی قسەکەرە.

ئەمە پێی دەووترێ (الحد الحقيقي التام) واتا ئەو وەصفەی تۆ کردت بۆ مرۆڤ ڕێک حەقیقەتی مرۆڤە، چونکە تەنها مرۆڤ بە قسەکردن ناسراوە لەناو گیانلەبەراندا، وە قسەکردن صیفەتێکی ذاتیە، واتا دەبێتە حەقیقەتێکی تەواو.

**الحد الحقيقي الناقص:** گەر لێت بپرسن مرۆڤ چیە ؟ تۆش بڵێێ: قسەکەرە.

ئەمە پێی دەووترێ (الحد الحقيقي الناقص) ڕاستە مرۆڤ قسەکەرە وە قسەکردن صیفەتێکی ذاتیە، بەڵام ئاماژەت بەوە نەدا کە گیانلەبەرە، بۆیە دەبێتە حەقیقەتێکی ناتەواو.

**الحد الرسمي التام:** گەر لێت بپرسن مرۆڤ چیە ؟ تۆش بڵێێ: گیانلەبەرێکە پێدەکەنێ.

ئەمە پێی دەووترێ (الحد الرسمي التام) ڕاستە مرۆڤ گیانلەبەرە و پێش دەکەنێ، بەڵام پێکەنین صیفەتێکی ذاتی نیە دێت و دەڕوات بۆیە دەبێتە (الحد الرسمي التام).

**الحد الرسمي الناقص:** گەر لێت بپرسن مرۆڤ چیە ؟ تۆش بڵێێ : پێدەکەنێ.

ئەمە پێی دەووترێ (الحد الرسمي الناقص) چونکە تۆ باسی ئەوەت نەکرد جنسی مرۆڤ چیە کە بریتیە لە (گیانلەبەر) تەنها صیفەتێکی مرۆڤت باسکرد.

بۆیە بەم جۆرە دەووترێ (الرسمي) چونکە وێنە – ڕسم ی شتەکە نیشان دەدات.

**الحد اللفظي:** بریتیە لە پێناسەکردنی شتێک بە ووشەیەکی هاوتای خۆی (مرادف).

بۆ نموونە: بەکارهێنانی ووشەی پلیکانە بۆ پەیژە، هەردووکی هەمان شتن بەڵام بە ووشەیەکی تری هاوتا دەرت بڕی.

لە کۆتاییدا ئەم ووتەیەی (ابن تيمية) دەهێنم کە دەڵێ: کەسی زیرەک پێویستی بەم شتانە نیە، وە کەسی مێشک لاواز سوود لەم شتانە نابینێت.

بەڵام بۆ تێگەیشتن لە واتای ووتەکان ئەم ڕوونکردنەوەیەمان بە پێویست زانی.

ئێستاش دەگەڕێینەوە سەر وەڵامدانەوەی گومانەکە.

## وەڵامدانەوەی ئەم گومانە بە دوو جۆرە:

**یەکەم:** باسکردنی تەکفیری موشریکان لە پێناسەی ئەصلی دین و بنچینەکەی مانای ئەوە نیە کە تەکفیر لە ناوەوەی ماهیەتی تەوحید دایە، بەڵکو باسکردنی

**تەکفیر لێرەدا بریتیە لە پێناسەکردنی شتێک بە لێکەوتەکەی ئەمەش پێی دەووترێ (الحد الرسمي) کە لە دەرەوەی ماهیەتی شتەکە دایە، وە دوو جۆرەکەی تری پێیان دەووترێ (الحد الحقيقي) و (الحد اللفظي).**

**الأمير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە پێناسەی (الحد الرسمي)دا دەڵێ:**

بریتیە لە پێناسەکردنی شتێک بە لێکەوتەکەی. **{بغية الآمل : لا 438}**

**هەر الأمير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە پێناسەی (الحد الرسمي التام)دا دەڵێ:**

ئەمە لێکۆڵینەوەیە لە دەستەواژەی مەنطقیەکان، بریتیە لە شتێک کە لە دەرەوەی ماهیەتی ووشەکە دایە هەردووکیان یەک حەقیقەت دەیانگرێتەوە.

**{بغية الآمل : لا 440}**

**وە ئەم کارەی شێخ محمد بن عبد الوهاب هاوشێوەی هەیە لە دەربڕینەکانی هەندێک زانای سەلەف لە تەفسیرکردنی کتێبی الله تعالى دا.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

لە سەلەف هی واهەیە ووشەکە دەردەبڕێت بە لێکەوتەکەی یان بە هاوتاکەی، وە هەیانە خودی ووشەکە دەردەبڕێت، وە هەمووی بە یەک مانا دێت لە زۆربەی ئایەتەکاندا، جا کەسی زیرەک با درک بەمە بکات، وە الله هیدایەت دەرە.

**{مجموع الفتاوى : 369/13}**

**دووەم: ووتەی شێخ محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) وا لێکدانەوەی بۆ دەکرێت کە ڕوونکردنەوەی گرینگی تەکفیرکردنی موشریکانە لە دیندا، نەوەک ئەو مەبەستی ئەوە بێت کە تەکفیرکردن ئەصلی دینە کە بە زەڕوڕەتی عەقڵ و فیطرەت دەزاندرێ، جا گەر وابێت ئەوا هەرکەسێک لە بابەتی تەکفیردا هەڵە بکات ئەوا کافر دەبێت وە عوزری نابێت بە جەهل و بە تەئویل، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە لەلای ئەهلی سوننە و جەماعەتدا باسکراوە هەروەک پێشتر ڕوونمان کردەوە، وە پێچەوانەی ئەوەیە کە شێخ محمد بن عبد الوهاب خۆی لەسەری بووە، هەروەک بە ڕوونی لە نامەکانی و باسکردنەکانی بۆ ئەم بابەتە دەردەکەوێت.**

**وە هەرکەسێک ووتەکانی شێخ وا لێکبداتەوە کە تەکفیرکردن لە ئەصلی دینە، وە هیچ کەسێک عوزری بۆ نیە بە جەهل و بە تەئویل تیایدا، یان تەکفیرکردن لە**

ئەصلی کوفرکردنە بە طاغوت، ئەوا ئەم ووتەیەی پابەندی دەکات بەوەی کە بڵێ بە ئیسلامدانانی موەحیدانیش لە ئەصلی دینە، وە هەرکەسێک موسڵمانێک بە هەڵە تەکفیر بکات ئەوا دەبێتە موشریك وە عوزری نیە بە جەهل و بە تەئویل، بە تایبەتی کە فەرموودەیەک لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە باسی ئەوە دەکات ئەصلی ئیسلام بریتیە لە دەست هەڵگرتن لەسەر ئەو کەسەی کە دەڵێ: لا إله إلا الله. هەروەک لە شوێنی خۆیدا دێت بە پشتیوانی الله تعالى.

وە ناولێنانی شێخ محمد بن عبد الوهاب لە یەکێک لە حوکمە گرینگەکانی شەریعەت بە ئەصلی دین، هاوشێوەی هەندێک فەرموودە و ئاثارە کە هاتوون، وە هاوشێوەی ووتەی زۆربەی زانایانە، کە کاتێک باسی بابەتێکی گرینگی شەریعەت دەکەن بە (ئەصلی دین) ناوی دەبەن بۆ ڕوونکردنەوەی گرینگیەکەی، نەوەک لەبەر ئەوەی یەکێکە لەو شتانەی کە بەهۆی زەرورەتی فیطرەت دەزانرێ، وە هەندێک لەم نموونە باس دەکەین:

**1. ئەوەی لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە فەرموویەتی:**

(من أصل الدين الصلاة خلف كل بر و فاجر، والجهاد مع كل أمير ولك أجرك، والصلاة على كل من مات من أهل القبلة).

**{رواه الدارقطني في سننه : ب 3/ لا 402/ ژ 1765} وە الدارقطني دەڵێ: هیچ فەرموودەیەک لەم بارەیەوە جێگیر نەبووە (وەرگێڕ: واتا هیچ فەرموودەیەک لەم بارەوەیە صحيح نیە).**

**(وەرگێڕ: واتا نوێژکردن لە پشت هەموو کەسێکی باش و خراپ، وە جیهادکردن لەگەڵ هەموو سەرکردەیەک کە تۆش پاداشتی خۆت وەردەگریت، وە نوێژکردن لەسەر هەرکەسێک لە ئەهلی قیبلە کە بمرێت، ئەمانە لە ئەصلی دینن).**

**2. ئەوەی لە "علي"ەوە (رضي الله عنه) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:**

نوێژ ئەصلی دین و ڕاگری دینە. **{أمالي ابن بشران : لا 222/ ژ 512}**

**3. ووتەی القاسم الجوعي (رحمه الله) کە دەڵێ:**

ئەصلی دین وەڕعە. **{الخطيب البغدادي : الزهد و الرقائق} لا 76/ ژ32**

**4. ووتەی القاسم بن سلام (رحمه الله) کە دەڵێ:**

پاکیەتی لە ئەصلی دینە کە واجبە. **{القاسم بن سلام : الطهور} لا 235**

**5. ابن بطة العكبري** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

بزانە ڕەحمەتی خوات لێبێ، **ئەصلی دین** ئامۆژگارییە. {الإبانة الكبرى : 546/2}

**6. شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین** بریتیە لە جوانی نیەت و ئیخلاصی مەبەست. {مجموع الفتاوى : 58/16}

**7. هەر شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین** بریتیە لەو دادپەروەرییەی کە الله پێغەمبەرانی پێ ناردووە بە چەسپاندنی.
{مجموع الفتاوى : 24/19}

**8. وەهەر شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین** ئەنجامدانی واجبەکان و وازهێنان لە حەڕامەکانە.
{مجموع الفتاوى : 136/22}

**9. وەهەر شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین** بریتیە لە فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە. {مجموع الفتاوى : 442/27}

**10. عەللامە ابن القيم** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

**ئەصلی دین** غیرەتە، وەهەرکەسێک غیرەتی نەبێ دینی نیە. {الداء والدواء : لا 68}

**(تێبینی مكتب البحوث و الدراسات) : هەندێک لەم ووشانەی سەرەوە لە لایەنێک لە لایەنەکان دەچنە ناو ئەصلی دینەوە وەکو: غیرەت و دادپەروەری و ئامۆژگاری و ئیخلاصی مەبەست، گەرچی خودی ووشەکە ئەم مانایە نادات.**

**نموونەی هاوشێوەی ئەمانە زۆرە لە ووتەی زانایاندا گەر کەسێک بەدوایدا گەڕابێت، کە زانایان بیانەوێ گرینگی یەکێک لە بابەتەکانی شەریعەت ڕوون بکەنەوە ئەوا ناوی لێدەنێن (ئەصلی دین) وە پێویستە ووتەکەی شێخ (محمد بن عبد الوهاب)یش بەم شێوەیە لێکدانەوەی بۆ بکرێت.**

**ئەمە لە کاتێکدا لە ووتەی زانایاندا دەردەکەوێ لە پێناسەی (ئەصلی دین)دا، کە بریتیە لە ووتەیەکی موحکەم موتەشابیهی تێدا نیە، زانایان هەندێک شتیان بە ئەصلی دین ناوبردووە پاشان بە ووتەیەکی موحکەم ڕوونیان کردۆتەوە کە مەبەستیان چی بووە لە ئەصلی دین وەکو ئەمانە: عوزر بە جەهل تیایدا نیە، یان**

**له فیطرەتی هەموو کەسێکدا چەسپاوە، یان بە زەروورەتی عەقڵ زانراوە، وە هاوشێوەی ئەمانە.**

**وە زانایان ئەو شتەی لە ئەصلی دینە تەنها بە ووشەی (ئەصلی دین) تەعبیریان لێ نەکردووە تاوەکو وا لە ووتەکانیان تێنەگەن کە مەبەستیان ئەوەیە ئەم شتە لە بابەتە گرینگەکانی شەریعەتە، بەم شێوەیەش موتەشابیە و موحکەم لە ووتەی زایاندا جیادەکرێتەوە دەربارەی مەبەستی بەکارهێنانیان بۆ ووشەی (ئەصلی دین).**

**لەمەی خوارەوەدا چەند نموونەیەک لە ووتەی زانایان لەم بارەیەوە باس دەکەین:**

**إمام المفسرين ابن جرير الطبري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) پاش باسکردنی چەند شتێک لە ئەصلی دین پاشان دەڵێ:** ئەوەی لە پێشوودا باسمان کرد لە صیفاتەکانی (الله تعالى) هیچ کەسێک عوزری نەزانینی ئەم صیفەتانەی نیە کە گەیشتبێتە بالغ بوون، جا ئەو کەسە الله (تعالى ذكره) پێغەمبەری بۆ ناردبێت یان نا، وە ئەو کەسە کەسی تری بینیبێت جگە لەخۆی یان نەی بینیبێت. {التبصير في معالم الدين : لا 126-132}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەصلی دین بریتیە لە بەندایەتیکردن بۆ الله کە ئەصلەکەی خۆشەویستی و گەڕانەوە و پشت تێکردنە لە غەیری الله، ئەمەش ئەو فیطرەتەیە کە الله خەڵکی لەسەر دروستکردووە. {مجموع الفتاوى : 438/15}

**ابن القيم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

چ شتێک لە عەقڵدا تەواوە گەر عەقڵ هەست بە ناشرینی شیرك نەکات، وە زانینی ناشرینی شیرك شتێکی سروشتیە بەهۆی زەرەروتی عەقڵ دەزانرێ، وە پێغەمبەران ئوممەتانیان بەهۆش دەهێنایەوە لەوەی کە لە عەقڵ و سروشتیاندا هەیە دەربارەی ناشرینی شیرك. {مدارج السالكين : 253/1}

**هەر ابن القيم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

بزانە گەر جوانی تەوحید و ناشرینی شیرك بەهۆی عەقڵەوە نەزاندرێت و لە فیطرەتدا جێگیر نەبێت، ئەوا نابێت پشت بە هیچ بابەتێک ببەسترێ لە عەقڵدا، چونکە ئەم بابەتە لە دیارترین بابەتە سروشتیە ڕوونەکانە، وە ڕوونترین شتە کە الله لەناو عەقڵ و فیطرەتدا دروستی کردووە. {مدارج السالكين : 455/3}

**وەهەر ابن القيم (رحمه الله) دەڵێ:**

بەرزی الله تعالى لەسەر جیهان و لەسەر هەموو ئاسمانەکاندا، وە ئەو لەسەر عەرشە، ئەمە شتێکە لە فیطرەتدا چەسپاوە زەرورەتێکی زانراوە، هەروەک هەموو ئوممەتان لەسەر ئەم شتە یەکدەنگن و دانی پێدەنێن و باوەڕیان پێی هەیە، بەبێ ئەوەی ئەم ئوممەتانە لەسەر ئەم شتە ڕێککەوتبێتن و هەستیان بەیەکتری کردبێت، وە ئەوانە دەربارەی خۆیان دەڵێن: ئێمە درک بەم شتە دەکەین بە زەرورەت، وە هەموو کۆمەڵەکان ئینکاری ووتەی ئەوانە دەکەن کە صیفاتەکانی الله (تعطيل) نەفی دەکەن، مەگەر کەسێک ئەم بیروباوەڕەی لەوان وەرگرتبێت، ئەگینا گشت خەڵکی لەناو هەموو دینەکاندا فیطرەتیان لەسەر ئەوە چەسپاوە کە الله لەسەر جیهانە.

{الصواعق المرسلة : 1281/4}

(وەرگێڕ: مەبەستی "ابن القيم" ئیثبات کردنی صیفەتی "العلو"ە لەناو هەموو دینەکاندا، بە پێچەوانەی جەهمی و هاوشێوەکانیان).

**جا هەرکەسێک خۆی یەکلاکردبێتەوە بۆ زانینی حەق و کارپێکردنی، پێویستە لەسەری ووتە موحکەمەکان وەربگرێت، وە بۆ تێگەیشتنی ووتەی موتەشابیە پێویستە بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر ووتەی موحکەم، وەکو ڕێبازی ئەوانە نەبێت کە لادان و گومان(زیغ) هەیە لە دڵیاندا شوێنی ووتەی موتەشابیە بکەوێت، وە واز لە ووتەی موحکەم بهێنێت بۆ دروستکردنی فیتنە پەنا بە الله تعالى.**

## گومانی دووەم:

**فەرموودەیەکە لە پێغەمبەر (ﷺ) ڕیوایەت کراوە تیایدا باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر (ﷺ) پێش بوونی بە پێغەمبەر دەیزانی موشریکەکان کافرن.**

**لە "علي"ەوە (رضي الله عنه) کە دەڵێ:**

قيل للنبي (ﷺ) هل عبدت وثنا قط ؟ قال: لا، قالوا: هل شربت خمرا قط ؟ قال: لا، وما زلت أعرف أن الذي هم عليه كفر، وما كنت أدري ما الكتاب والإيمان، ولذلك أنزل الله في القرآن: ﴿ **مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الْإِيمَانُ** ﴾ [الشورى : 52].

(تێبینی مکتب البحوث والدراسات) : فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە (حديث موضوع) الواحدي ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (التفسير الوسيط) بەرگی 4 لاپەڕە 62، سەنەدەکەی (إسماعيل بن يحيى التيمي) تێدایە کە کەسێکی درۆزنە، هەروەک لە بەرگی 1 لاپەڕە 253ی

کتێبی (میزان الإعتدال)دا هاتووە، وە ئیمام الذهبي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەسەر وازهێنان لە فەرموودەکانی إسماعیل.

(وەرگێڕ: واتا بە پێغەمبەر (ﷺ) ووترا هیچ بتێکت پەرستووە ؟ فەرمووی: نەخێر، ووتیان هیچ عەرەقت خواردۆتەوە ؟ فەرمووی: نەخێر، تاکو ئێستاش هەر دەمزانی ئەوەی ئەوانی لەسەرە کوفرە، لەکاتێکدا من ئەوکات نەمدەزانی قورئان چیە و ئیمان چیە، بۆیە الله لە قورئاندا دایبەزاندووە: ﴿ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ ﴾ [الشورى : 52].

(وەرگێڕ: بەگوێرەی فەرموودەکە بێت پێش وەحیش پێغەمبەر زانیویەتی کە ئەوان کافرن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت تەکفیرکردن لە ئەصلی دینە، چونکە ئەصلی دین بەبێ وەحی دەزاندرێ، بەڵام کە زانیمان فەرموودەکە هەڵبەستراوە ئەوا بەڵگەکە پوچەڵ دەبێتەوە).

## وەڵامی گومانەکە:

ئەم فەرموودەیە هەڵبەستراوە هەروەک ڕوونمان کردەوە، گەر واش دابنێین صەحیحە ئەوا ئەوپەڕی ئەو مانایەی کە فەرموودەکە دەیدات ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) لەوپەڕی کەمالی عەقڵ و فیطرەتدا بووە پێش بوونی بە پێغەمبەر، مانای ئەوە نیە تەکفیرکردن لە شتە زەرورە زاندراوەکانە هەموو خەڵکی یەکسانن لە زانینیدا پێش هاتنی وەحی.

## گومانی سێیەم:

شتێک ڕیوایەت کراوە کە مانای ئەوە دەدات موەحیدان تەکفیری موشریکانیان کردووە پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ).

لە **"أسماء بنت أبي بكر"** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) کە دەڵێ:

"زيد بن عمرو بن نفيل"م بینی پشتی بە کەعبە دابوو، دەیووت: ئەی کۆمەڵی قورەیش هیچ یەکێک لەئێوە ئەمڕۆ لەسەر دینی إبراهیم (عَلَيْهِ السَّلَامُ) نیە جگە لە من.

{صحيح البخاري : ژ 3828}

کە دەڵێ: (هیچ یەکێک لەئێوە ئەمڕۆ لەسەر دینی "إبراهيم عليه السلام" نیە جگە لە من) ڕووکەشی فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەکفیری کردوون.

## وەڵامی گومانە:

ئەم بابەتە لە دەرەوەی خیلافە، چونکە "زید" لەسەر دینی (إبراهیم عَلَيْهِ السَّلَامُ) بووە کاتێک ئەمەی ووتوە، جا ووتەکەی تەنها لە فیطرەت وەرنەگرتووە بەبێ پشت

**بەستن بە وەحی، وە دوور نیە "زید" ئەمەی پێگەیشتبێت کاتێک پرسیاری کردووە هیچ شتێکی دەربارەی تەکفیری ئەوان نەدەزانی تەنها ئەوەی دەزانی کە ئەوان لەسەر گومڕایین. وە شتێک ڕیوایەت کراوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەمە:**

**لە "زيد بن حارثة"ەوە (رضي الله عنه) کە دەڵێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوە ببێتە پێغەمبەر بە "زید بن عمرو بن نفیل"ی ووت: ئەی کوڕی مامم بۆچی قەومەکەت ڕقیان لێتە ؟ زید ووتی: سوێند بە الله ئەو ڕقەی ئەوان لەبەر ئەوەیە نیە کە شتێکم لێیان کردبێت تاکو ئەوان توڕەبن و تۆڵەم لێ بستێنن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە من وایدەبینم ئەوان لەسەر گومڕایین، بۆیە گەڕام بەدوای ئەم دینەدا. {رواه ابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني - بسند ضعيف} ب 1/ لا 199/ ژ 257

**لە "شداد بن أوس"ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

کاتێک پێگەیشتم ڕقم بۆ دروست بوو بەرامبەر بە بت.

{رواه أبو يعلى في مسنده الكبير – إتحاف الخيرة المهرة} ب 7/ لا 16/ ژ 6319

وقال البوصيري : هذا إسناد ضعيف

**لە "عمرو بن عبسة السلمي"ەوە (رضي الله عنه) کە دەڵێ:**

من لەسەردەمی جاهیلیەت دابووم وام گومان دەبرد کە خەڵکی لەسەر گومڕایین و لەسەر هیچ حەقێک نین، وە خەڵکی بت پەرست بوون. {صحيح مسلم : ژ 832}

**گەر تەنازول بکەین و واش دابنێین "زید بن عمرو بن نفیل" درکی بە تەکفیرکردنی موشریکان کردووە بەهۆی عەقڵیەوە، ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە هەموو خەڵکی یەکسان بن لە درک پێکردنی ئەمە بەهۆی عەقڵ و فیطرەتیانەوە، بەڵکو ئەوپەڕی ئەو مانایەی دەیدات ئەوەیە کە دەتوانرێ درک بەمە بکرێت بەهۆی عەقڵەوە، نەوەک ئەمە شتێک بێت عەقڵ و فیطرەت بە زەڕورەت درکی پێ بکەن.**

(وەرگێڕ: لە صەحیحی بوخاری بە ژمارە 3827 هاتووە کە "زید بن عمرو بن نفیل" چۆتە شام بۆ بەدوا گەڕانی دینێک دوور لە دینی موشریکان، زاناکانی یەهود و نەصاراش پێیان ووتوە بچۆ سەر ئیبراهیمی حەنیف کە نە یەهودیە نە نەصڕانیە وە بریتیە لە بەندایەتیکردن بۆ الله بە تەنها..... ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دوای گەڕانەوەی "زید بن عمرو بن نفیل" لە شام دەزانێت کە ئەوەی قوڕەیش ئەنجامی دەدات دینی ئیبراهیم نیە، بۆیە دەڵێت جگە لە من کەستان لەسەر دینی ئیبراهیم نین).

***

# بابەتی پێنجەم

## پلەی کەسە وەستاوەکان لە تەکفیرکردنی کافران وە حوکمەکانیان

**بزانە ڕەحمەتی خوات لێبێ ئەم بابەتە لەسەر ئەم دوو پێشەکیە دامەزراوە:**

**یەکەم: کوفری گەورە چەند پلەیەکی هەیە، لە کتێبی الله تعالی دا هاتووە کە کوفر زیاد دەکات، وە هەندێکی لە هەندێکی توندترە، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ ﴾** [التوبة : 37] (واتا: دواخستن و پێش خستنی مانگە حەرامکراوەکان زیاتربوونە لە کوفردا)، **وە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا ﴾** [آل عمران : 90] (واتا: ئەوانەی کافربوون دوای ئیمان هێنان پاشان کوفرەکەیان زیاتربوو)، **وە الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا ﴾** [التوبة : 97] (واتا: کوفر و نیفاقی دەشتەکیەکان توندترە لەهی خەڵکی شار).

**دووەم: تەکفیر چەند پلەیەکی هەیە، زانایان باسی ئەوەیان کردووە کە تەکفیر حوکمێکی شەرعیە چەند پلەیەکی هەیە بەگوێرەی بەهێزی چەسپانی لە شەرعدا یان لەسەر کەسێکی دیاریکراودا.**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رحمه الله) دەڵێ:**

تەکفیر حوکمێکی شەرعیە، دەبێتە هۆکاری حەڵاڵ کردنی ماڵ و ڕشتنی خوێن و حوکمدان بە مانەوەی تاهەتایی لە دۆزەخ، جا وەکو هەموو حوکمە شەرعیەکانی تر لە شەرعەوە وەردەگیرێت، جاری واهەیە بە یەقینی دەزاندرێ، وەجاری واهەیە بە گومانێکی بەهێز دەزاندرێ، وە جاری واهەیە دوو دڵی تێدا دەبێت، جا هەرکاتێک دوو دڵی ڕوویدا وەستان لە تەکفیر باشترە، وە دەست پێشخەری کردن لە تەکفیر بەسەر سروشتی ئەو کەسانەدا زاڵە کە جەهل بەسەریاندا زاڵە.

{بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة و القرامطة و الباطنية : لا 345}

**جا لەسەر ئەمە، ئەوانەی دەوەستن لە تەکفیرکردنی کافران چەند پلە و حاڵەتیان هەیە کە ئاشکرایی حوکمی شەرعی و ئاشکرایی حاڵی ئەو کەسەی کەوتۆتە ناو**

**کوفرەکەوە کاردەکاتە سەر ئەم پلە و حاڵەتانە، وە ووتەی زانایان هەیە کە بەڵگەیە لەسەر ئەمە:**

**شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رحمه الله) دەڵێ:**

ئەم طاغوتانەی کە خەڵکی شاری (الخرج) و شوێنانی تریش بڕوایان وایە تایبەت مەندی خوایەتیان تێدایە ناسراون لەلای زانا و خەڵکی عەوامیش، وە ئەمانە خۆیان هەڵدەبژێرن بۆ طاغوتی و فرمان بە خەڵکی دەکەن بۆ ئەم کارە، جا ئەمانە هەموویان کافرن و هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام، وە هەرکەسێک موناقەشەیان لەسەر بکات (وەکو بەگریکردن لێیان) یان ئینکاری لەسەر ئەو کەسانە بکات کە تەکفیریان دەکەن، ئەوا کەمترین پلەی ئەم کەسە ئەوەیە کە فاسقە، وە شایەتی قبوڵ ناکرێت چ بە نوسین بێ چ بە دەم بێ، وە نوێژی لە پشت ناکرێت. {الدرر السنية : 52/10}

**لە ووتەکەی بڕوانە (رحمه الله) چۆن پلەی بۆ ئەو کەسانە دانا کە دەوەستن لە تەکفیرکردنی ئەم طاغوتانە کە کەمترین پلەی فاسق بوونە، ئەمەش تەئکید لەوە دەکاتەوە کە ئەوانەی دەوەستن لە تەکفیرکردنی موشریکان چەند پلەیەکیان هەیە کە بەهێزی بەڵگەی شەرعی و ئاشکرایی کوفرەکە یان شیرکەکە کاریگەری لەسەر پلەکان هەیە، بەبێ ڕەچاوکردنی توندی کوفرەکە یان شیرکەکە، جاری واهەیە شیرکێک لەوپەڕی توندی دایە بەڵام لە دەرکەوتن و ئاشکراییدا کزترە لە شیرکێک کە توندیەکەی کەمتریشە.**

**نموونەیەک لەسەر ئەمە:**

**شیرکی بت پەرستان و شیرکی جەهمیەکان، حوکمدان بە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دەوەستێ لە تەکفیرکردنی بت پەرستان بەهێزترە وەک لەوە جەهمیەکان، چونکە شیرکی بت پەرستان زیاتر ئاشکرا و دیارترە لە جەهمیەت، کەچی شیرکی جەهمیەت توندترە لە هی گۆڕپەرستان.**

**عەللامە ابن القيم (رحمه الله) دەڵێ:**

کەسێکی موشریك کە دان دەنێت بە صیفاتەکانی پەروەردگار باشترە لە کەسێک کە ئینکاری و تەعطیلی صیفاتەکانی کەمالی الله تعالى دەکات، هەروەک چۆن کەسێک دان دانێت بە مولکی پاشایەک و ئینکاری مولکەکەی ناکات و ئینکاری ئەو صیفەتانە ناکات کە پاشا شایەنیەتی بەڵام لە هەندێک کاردا هاوبەشی بۆ پاشا داناوە تاکو لە

پاشای نزیک بکاتەوە، ئەم کەسە باشترە لەو کەسەی کە ئینکاری صیفەتەکانی پاشا دەکات و ئینکاری ئەو شتانە دەکات کە پێی بۆتە پاشا، ئەمەش شتێکی جێگیرە لە هەموو عەقڵ و فیطرەتێکدا، تانە دان لە صیفاتەکانی کەمالی الله و ئینکارکردنی لەکوێ، وە پەرستنی نێوەندێک (واسطة) لەنێوان پەرستراوی حەق و بەندەیەکی عیبادەتکار لەکوێ ؟ دەردی نەفیکردنی صیفاتەکان دەردێکی بێ چارەسە و دەرمانی نیە. {الداء والدواء : لا 144}

**هەر ابن القیم (رحمه الله) دەڵێ:**

شیرکی بت پەرستان و ڕۆژ و مانگ و هەسارە پەرستان زۆر چاکترە* لە تەوحیدی ئەمانە (جەهمیەکان) چونکە شیرکی ئەمانە لە بەندایەتیکردن دایە بەڵام دان بەوە دەنێت کە الله دروستکەری گەردوونە وە دان دەنێن بە صیفاتەکانی و کردەوەکانی و قودرەتی و ویستی و عیلمی بە تەواوی شتەکان و ووردەکارییەکان، بەڵام تەوحیدی ئەمانە (جەهمیەکان) بریتیە لە نەفیکردنی ڕوبیەت و ئولوهیەت و هەموو صیفاتەکانی، وە ئەم جۆرە تەوحیدە گەورەترین جۆری شیرکی لێدەکەوێتەوە، هەر بۆیە کەسێک چەندە نەفیکردنەکەی گەورەتر بێ ئەوا شیرکەکەی گەورەتر دەبێ.

{مختصر الصواعق المرسلة : لا 186}

**بەگوێرەی ئەو شتانەی پێشوو باسی پلەی وەستاوان دەکەین لە تەکفیرکردنی موشریکان یان کافران بەگوێرەی ئاشکرایی بەڵگە لەسەر کوفرەکانیان و ناوبانگی بەڵگەکان، وە بەگوێرەی حاڵی موشریکان یان کافران، لەمەشدا پشت بە ووتەی زانایان دەبەستین:**

**پلەی یەکەم: ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە کوفرەکەی زانراوە بە زەڕوڕەت لە هەموو دینەکاندا، نموونە لەمانە:**

**1. ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئیبلیس یان فیرعەون یان بانگەشەکەری خوایەتی بۆ خۆی یان بۆ غەیری خۆی.**

**2. ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی بت پەرستان ئەگەرچی خۆشیان بدەنە پاڵ ئیسلام.**

**حوكمی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردن لەم پلەیەدا کافربوونە، هەرکەسێک پەیامی الله ی پێگەیشتبێت ئەوا عوزری نیە بە جەهل لە تەکفیرنەکردنی ئەمانە، چونکە کوفری ئەمانە زانراوە بە زەروڕەت لە هەموو دینەکاندا.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە فیرعەون تەکفیر ناکات دەڵێ:** زەروڕەتێکی زانراوە لە هەموو دینەکاندا دینی موسڵمانان و یەهود و نەصارا کە فیرعەون یەکێک بووە لە کافرترین بوونەوەرەکان بە الله. {مجموع الفتاوى : 125/2}

**هەر شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە بت پەرستی بە ڕاست دەزانێت دەڵێ:** هەرکەسێک بت پەرستان تەکفیر نەکات ئەوا لە یەهود و نەصارا کافرترە، چونکە یەهود و نەصارا تەکفیری بت پەرستان دەکەن. {مجموع الفتاوى : 128/2}

**ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هیچ گومان لەوە دانیە کە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی بت پەرستان ئەوا واجبە تەکفیر بکرێت، وە واجبە تەکفیری ئەو کەسەش بکرێت کە تەکفیری بت پەرستان ناکات، هۆکاری ئەم تەکفیرکردنەش تەنها ئەوەیە کە کوفری بت پەرست شتێکی مەعلومە لە دیندا بە زەروڕی. {الروض الباسم : 509/2}

**شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

کەسێکی ڕافیزی ئەگەر باوەڕی وابوو "علي يان حسين" وەکو الله شتیان پێ دەکرێ ئەوا ئەو کەسە کافرە بە ئیجماع، وە کەسێکی سوننی گەر گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەم ڕافیزەیە ئەوا ئەویش کافرە. {الدرر السنية : 129/10} بە دەستکارییەوە

**الملا علي القاري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی "دەججال" دەڵێ:**

هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافری و درۆزنی دەججال، ئەوا کافر دەبێت.

{مرقاة المفاتيح : 3470/8}

**وە بە صەحیحی بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێک عوزری نیە لە وەستان لە تەکفیرکردنی "دەججال" لە (الصحيحين)دا هاتووە لە "أنس"ەوە (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (الدجال ممسوح العين، مكتوب بين عينيه كافر، ثم تهجاها: كَ فَ رَ، يقرؤه كل مسلم). {متفق عليه} البخاري : ژ 7131 ، مسلم : ژ 7473

(وەرگێڕ: واتا دەججال چاوێکی سڕاوەتەوە، لەنێوان هەردوو چاویدا نوسراوە کافر. پاشان خوێندیەوە بەم شێوەیە: ك ف ر، هەموو موسڵمانێک دەتوانێت بیخوێنێتەوە).

**أبو العباس القرطبي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:**

ئەمەش شتێکە بە بینراوی هەستی پێدەکرێ، شایەتە بۆ درۆزنی و کافری جەججال.

{المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم : 106/23}

**النووي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی فەرموودەکە دەڵێ:**

ئەوەی ڕاستە و زانایانی لیکۆڵەر لەسەرینە ئەم نوسینە شتێکی ڕاستەقینە و نوسینی تەواوە، الله کردویەتی بە بەڵگەیەک و نیشانەیەک لەو کۆمەڵە نیشانانەی کە کافری و درۆزنی و باطلی دەججالی تێدا بڕاوتەوە، وە الله تعالى ئەم نوسینە نیشانی هەموو موسڵمانێک دەدات چ نوسین بزانێت یان نەزانێت، وە دەیشارێتەوە لەو کەسانەی کە دەیەوێ چارەنوس خراپ بن و توشی فیتنە بن. {شرح صحيح مسلم : 60/18}

***

**پلەی دووەم: ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەوانەی کە کوفرەکانیان زانراوە بە زەروڕەت لە دینی موسڵمانان بە تایبەتی، هەروەک ئەوەی دەوەستێ لە تەکفیرکردنی یەهود و نەصارا یان هەرکەسێک کە وازی هێنابێت لە دینی ئیسلام.**

**حوکمی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردن لەم پلەیەدا کافربوونە، هەرکەسێک پەیامی الله ی پێگەیشتبێت ئەوا عوزری نیە بە جەهل لە تەکفیرنەکردنی ئەمانە.**

**القاضي عياض (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەو کەسە تەکفیر دەکەین کە ئەوانە تەکفیر ناکات کە لەسەر دینێکن غەیری دینی موسڵمانان، یان بوەستێ لە تەکفیر کردنیان یان گومانی هەبێ لە تەکفیر کردنیان یان بیروباوەڕیان بەڕاست دابنێت. {الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 286/2}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک دوای ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) ماناوە لەسەر دینی یەهود و نەصارای پێ حەڕام نەبێت، بەڵکو هەرکەسێک تەکفیریان نەکات و ڕقی لێیان نەبێت ئەوا ئەو کەسە موسڵمان نیە بە یەکدەنگی موسڵمانان. {مجموع الفتاوى : 464/27}

***

**پلەی سێیەم: ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی خۆی داوەتە پاڵ ئیسلام وە کەوتۆتە ناو شیرکێک یان کوفرێک کە ئیجماع هەیە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە تێیدەکەوێ، ئەمانەش چەند پلەیەکیان هەیە.**

**1. کەسی وەستاو تەئویلی نەبێت، ئەمەش چەند حاڵەتێکی هەیە:**

**یەکەم: حاڵی کافرەکان دیاربێت و حوکمی شەرعیش دەربارەیان دیاربێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو لە سەرەتاوە تەکفیر دەکرێت.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی "الدروز" دەڵێ:**

**موسڵمانان خیلافیان نیە لە کوفری ئەمانە**، بەڵکو هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەمانە ئەوا وەکو ئەوان کافرە. **{مجموع الفتاوى : 162/35}**

**دووەم: حاڵی کافرەکان دیارنەبێت و حوکمی شەرعی دەربارەیان دیاربێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت ئیللا دوای ڕوونکردنەوەی حاڵی کافرەکان بۆی.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی کۆمەڵێکی "باطني" دەڵێ:**

هەرکەسێک گومانی باشیان پێ ببات و بڵێ **من ئاگاداری حاڵیان نیم**، ئەوا حاڵی ئەوانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە، جا گەر خۆی لێیان جیانەکردەوە و ئینکاری خۆی دەرنەخست بۆیان ئەوا دەچێتە ناو ئەوان و بە یەکێک لەوان دادەنرێت. **{مجموع الفتاوى : 132/2}**

**سێیەم: حاڵی کافرەکان دیاربێت و حوکمی شەرعی دەربارەیان شاراوە بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت، ئیللا دوای ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی بۆی دەربارەی ئەم کافرانە.**

**الإمام أبو حاتم الرازي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی ئەو کەسەی کە دەڵێ قورئان مەخلوقە دەڵێ:** هەرکەسێک لەوانەی **تێدەگات و جاهیل نیە** گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەوا کافر دەبێت، وە هەرکەسێک جاهیل بێت فێر دەکرێت، جا گەر ملکەچ حەق بوو تەکفیری کرد باشە، ئەگینا خۆی کافر دەبێت. **{طبقات الحنابلة : 286/1}**

**شێخ سليمان بن عبد الله** (رَحِمَهُمَاللَّهُ) **دەربارەی هەندێک مورتەدی زەمانەکەی دەڵێ:** گەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونیان یان ئاگاداری کوفرەکەیان نەبێت، **بەڵگەی بۆ ڕوون دەکرێتەوە لەسەر کافربوونیان** بەگوێرەی کتێبی اللە و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، جا دوای ئەمە گەر گومانی هەبوو یان دوو دڵ بوو لە تەکفیرکردنیان ئەوا ئەو کەسە کافرە بە ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەی هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی کافرێک ئەوا کافرە. {الدرر السنية : 160/8}

**شێخ محمد بن عبد اللطيف آل الشيخ** (رَحِمَهُٱللَّهُ) **دەڵێ:**

هەرکەسێک هەندێک شوێن تایبەت بکات بە عیبادەت، یان بڕوای وابێت هەرکەسێک لەم شوێنانە بوەستێ ئەوا فەریزەی حەجی لەسەر لادەچێت، ئەوا کوفری ئەم کەسە گومانی تێدانیە لای کەسێک کە بۆنی ئیسلامی کردبێت، وە هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی، ئەوا بێگومان **دەبێت ئیقامەی حوججەی لەسەر بکرێت**، وە بۆی ڕوون بکرێتەوە کە ئەمە کوفر و شیرکە، وە پێدانی تایبەت مەندی بەم دارانە چواندنیەتی بە شەعائیرەکانی اللە، کە اللە وەستان لای ئەم شتانەی وەکو بەندایەتیکردن بۆ خۆی داناوە، جا ئەگەر ئیقامەی حوججەی لەسەر کرا و هەر سوربوو لەسەر گومانەکەی، ئەوا گومان نیە لە کافربوونی. {الدرر السنية : 443/10}

**چوارەم: حاڵی کافرەکان شاراوە بێت و حوکمی شەرعیش دەربارەیان شاراوە بێت، لەم حاڵەتەدا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت ئیللا دوای ڕوونکردنەوەی حاڵی کافرەکان و حوکمی شەرعی دەربارەیان.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُٱللَّهُ) **دەربارەی "الحلولية" دەڵێ:**

هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەمانە **دوای زانینی بیروباوڕیان و ناسینی دینی ئیسلام** ئەوا ئەو کەسە کافرە، هەروەک ئەو کەسەی گومانی هەیە لە کافربوونی یەهود و نەصارا و موشریکان. {مجموع الفتاوى : 368/2}

**2. کەسی وەستاو عەقیدەی فاسد بێت و تەئویل بکات:**

**زۆری وکەمی ئاشکرایی کوفری کەسێکی دیاریکراو یان کۆمەڵەیەک کاریگەری هەیە لە حوکمدان لەسەر کەسە وەستاوەکە، لە حاڵەتێک کوفرەکە زۆر ئاشکرا بێت ئەوا کەسی وەستاو بە کافرێکی عیناد دادەنرێت دەیەوێت بە تەئویلەکەی خۆی**

**بپارێزێت لە تەکفیرکردن، وە لە حاڵەتانی نزمتر لەمە خیلاف هەیە لەنێوان فاسق بوون و کافربوونی کەسی وەستاو.**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی کۆمەڵێکی "باطني" دەڵێ:**

هەرکەسێک بڵێ (تەئویلی ئەوان موافیقی شەریعەتە)، ئەوا ئەو کەسە لە سەرکردە و پێشەوایانی ئەوانە، جا ئەو کەسە گەر زیرەک بێت ئەوا دەزانێت قسەکەی خۆی درۆیە، وە گەر بە ڕووکەشی و پەنهانی ئەمە بیروباوەڕی بێت ئەوا لە نەصاراش کافرترە، جا هەرکەسێک ئەمانە تەکفیر نەکات و تەئویل بۆ ووتەکانیان بهێنێتەوە، ئەوا بێگومان نەصارا هەر تەکفیر ناکات کە دەڵێن سێ خوا هەیە و یەکیان گرتووە.

**{مجموع الفتاوى : 133/2}**

**ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە هیچ ئیعتیباری بۆ تەئویلی کەسی وەستاو دانەنا دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە.**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

لە ئیمام ئەحمەدەوە دوو ڕیوایەت هەیە دەربارەی کافربوون و کافرنەبوونی ئەو کەسەی کە تەکفیری ئەهلی بیدعەکان ناکات، ڕاستەکەیان ئەوەیە کافر نابێت.

**{مجموع الفتاوى : 486/12}**

**(وەرگێڕ: دوای گەڕانەوە بۆ کتێبەکە دەرکەوت مەبەستی ابن تیمیة لە ئەهلی بیدعە قەدەرییە و خەواریج و جەهمیە و هەندێک ڕەوافیزە کە ڕەفزەکەیان زۆر نیە، نەوەک هەموو بیدعەیەک).**

**الإمام البخاري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

سەیری ووتەی یەهود و نەصارا و مەجوسم کرد، نەم بینی هیچیان لە کوفرەکانیاندا لە جەهمیەکان گومڕاتر بن، وە من ئەو کەسە بە جاهیل دادەنێم کە تەکفیری جەهمیەکان ناکات، مەگەر کەسێک کوفری جەهمیەکان نەزانێت.

**{خلق أفعال العباد : ب 2/ لا 24/ ژ 34}**

**المرداوي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ابن حامد لە کتێبەکەیدا (شرح أصول الدين) باسی کافربوونی خەواریج و ڕافیزە و قەدەرییە و مورجیئەی کردووە، وە ووتویەتی: (هەرکەسێک ئەوانە کافر نەکات کە بە کافرمان داناون ئەوا فاسق دەبێت و هەجر دەکرێت، وە دەربارەی کافربوونیشی دوو

ووته هەیە)، ئەوەی ابن حامد و جگە لەویش باسیان کرد لەوانەی لە "المروذي و أبو طالب و یعقوب" و جگە لەوانیش دەگێڕنەوە کە ئیمام ئەحمەد ووتویەتی: (کافر نابێت)،..... وە دەربارەی ئینکارکردنی موعتەزیلە بۆ هێنانە دەرەوە و گەڕاندنەوەی دڵی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوی ئیسراڕدا سەبارەت بە کافربوونیان دوو ووتە هەیە بەگوێرەی ئەصلەکەیان کە قەدەرییە ئایا ئینکاری عیلمی الله دەکەن و نەفی صیفەتی عیلم دەکەن بۆ الله یان نا، وە دەربارەی ئەو کەسەش کە دەڵێ: ئەو کەسە تەکفیر ناکەم کە جەهمیەکان تەکفیر ناکات سەبارەت بەویش دوو ووتە هەیە.

**{الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف : 324/10} بە دەستکارییەکی کەم**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رحمه الله) دەڵێ:**

سەلەف و پێشەوایان خیلافیان نەبووە لە تەکفیرنەکردنی مورجیئە و ئەو شیعانەی کە "عەلی" لە هەموو هاوەڵان بە باشتر دەزانن بەبێ تانەدان لە هاوەڵان وە هاوشێوەکانیان، وە خیلاف نیە لە ووتەکانی ئەحمەد کە ئەو تەکفیری ئەمانە ناکات، گەرچی هەندێک لە هاوەڵانی ئەوە دەگێڕنەوە کە ئەو تەکفیری هەموو ئەهلی بیدعەی کردووە ئەمانە و جگە لەمانەش، ئەمەش جێگای خیلافە لەسەر ئیمام ئەحمەد یان لە مەزهەبەکەی، تەنانەت هەندێکیان بە ڕەهایی دەڵێن ئەمانە و جگە لە مانەش تاهەتایە لە دۆزەخ دەمێننەوە، ئەمەش هەڵەیە بەرامبەر مەزهەبی ئەحمەد، وە هەڵەیە بەرامبەر شەریعەت. **{مجموع الفتاوى : 3/351}**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رحمه الله) وەڵامی ئەم ووتەیەی "القاضي أبو يعلى الفراء" دەداتەوە کە ووتویەتی ئەوەی جنێو بە الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بدات کافر دەبێت بەهۆی بە حەڵاڵ زانینی ئەم کارەی، جا ابن تیمیة دەڵێ:**

پێویستە بزانرێ ووتنی ئەوەی: کەسی جنێودەر کافر دەبێت بەهۆی بە حەڵاڵ زانینی جنێوەکەی، هەڵەیەکی گەورەیە ڕەحمەتی الله لە "القاضي أبا يعلى" لە چەندەها شوێنی تر بە پێچەوانەی ئەمەی ئێرە باسی کردووە، وە ئەوانەی کەوتونەتە ناو ئەم دۆڵەوە بەهۆی ئەوە بووە کە چەند ووتەیەکیان وەرگرتووە لە (متأخري المتكلمين) کە ئەوانیش جەهمیەکی مێینەن کە هەمان مەزهەبی جەهمیەی سەرەتایان هەیە دەربارەی ئیمان کە بریتیە لە باوەڕبوونی دڵ بە تەنها بەبێ ووتەی زمان و کرداری دڵ و ئەندامەکان. **{الصارم المسلول على شاتم الرسول : لا 515}**

ئەوەی تێبینی دەکرێت لێرەدا ئەوەیە کە شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رحمه الله) ئیعتیباری بۆ تەئویل داناوە لەم ووتەیەدا، چونکە "القاضي أبو يعلى"ی تەکفیر نەکرد بەڵکو ڕەحمەتی بۆ نارد.

### 3. کەسی وەستاو عەقیدەی صەحیح بێت و تەئویل بکات:

هەروەک هاتووە لە هەڵەی هەندێک هاوەڵان (رضي الله عنهم) دەربارەی تەکفیرکردنی هەندێک لە مورتەدان، الله هەڵەی ئەوانەی ڕوونکردەوە کە وەستاون لە تەکفیرکردنیان بەڵام حوکمی کافری بەسەردا نەدان.

هەروەک لە بابەتی پێشوودا باسکرا بە صەحیحی ئەثەر هاتووە لە "ابن عباس"ەوە (رضي الله عنهما) دەربارەی ووتەی الله تعالى: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾ [النساء : 97].

وە بە صەحیحی هاتووە لە هاوەڵاندا (رضي الله عنهم) کە خیلافیان هەبووە لە تەکفیرکردنی هەندێک لە مورتەدان، جا کاتێک الله تعالى کوفری ئەوانی ڕوونکردەوە فرمانی بەو هاوەڵانە نەکرد کە وەستابوون لە تەکفیرکردن دووبارە ئیمانیان نوێ بکەنەوە، ئەمە لەکاتێکدا الله سبحانه سەرزەنشتی کەسە وەستاوەکانی کرد، الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللّهُ وَمَن يُضْلِلِ اللّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلاً﴾ [النساء : 88].

(وەرگێڕ: واتا ئەمە چیتانە ئەی هاوەڵان بوونەتە دوو کۆمەڵە دەربارەی ئەم مونافیقانە، الله ئەمانەی گەڕاندەوە بۆ کوفر بەهۆی دەرئەنجامی کارەکانیان، ئایا دەتانەوێ بەو کەسە بڵێن لەسەر هیدایەتە لەکاتێکدا الله گومڕای کردووە، هەرکەسێک الله گومڕای بکات ناتوانن هیچ ڕێگایەکی هیدایەتی بۆ بدۆزنەوە).

وە بە صەحیحی هاتووە دەربارەی هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرچوو بەرەو ئوحد هەندێک لە خەڵکی گەڕانەوە لەوانەی کە لەگەڵی دەرچوو بوون، جا هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەیان بوون بە دوو کۆمەڵ، هەندێکیان ووتیان: دەیانکوژین، هەندێکیان ووتیان: نا.

{متفق عليه} البخاري : ژ 1399 ، مسلم : ژ 781

**وە بە صەحیحی هاتووە لە مجاهد (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) کە دەڵێ:**

کەسانێک لە مەککە دەرچوون بەرەو مەدینە هاتن وایاندەزانی کە کۆچبەرن، پاشان لەدوای ئەمە هەڵگەڕانەوە و داوای مۆڵەتیان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد کە ڕێگەیان بدات بگەڕێنەوە مەککە شتومەکەکانیان بهێنن تاوەکو بازرگانی پێ بکەن، جا ئیمانداران خیلافیان تێکەوت دەربارەیان، یەکێک دەیووت: ئەوانە مونافیقن، وە یەکێک دەیووت: ئەوانە ئیماندارن، جا اللە نیفاقی ئەوانی ڕوونکردەوە و فەرمانی کرد بە جەنگان لە دژیان. {رواه الطبري في تفسيره - بسند صحيح} ب 8/ لا 9/ ژ 10052

**وە ڕیوایەت کراوە لە "عبد الرحمن بن عوف و ابن عباس" (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ) بەم مانایەوە، وە نزیک لەم مانایە بە مورسەلێکی صەحیح هاتووە لە هەندێک لە تابعینەوە کە ئەوانیش بریتین لە: عکرمة و السدي و قتادة و محمد بن كعب القرظي (رَحِمَهُمُ ٱللَّهُ).**

{ڕیوایەتەکانی عبد الرحمن بن عوف و ابن عباس زەعیفن)

مسند الإمام أحمد : ژ 1667 ، تفسير الطبري : ژ 10054

{ڕیوایەتەکانی ئەم چوار تابعیە صەحیح و حەسەنن}

تفسير ابن أبي حاتم : ژمارە 5743 ، تفسير الطبري : ژ 10058 - 10055

تفسير القرآن من جامع ابن وهب : ژ 149

(وەرگێڕ: مرسل "مورسەل" واتا تابعی فەرموودەکە دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ ئەوەی هاوەڵ هەبێت لەنێوانیان).

**الإمام الطبري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا﴾ دەڵێ:**

واتا اللە ئەوانی گەڕاندەوە بۆ حوکمەکانی موشریك لە حەڵاڵی خوێنیان و بە کەنیزە گرتنی منداڵەکانیان. {تفسير الطبري : 7/8}

**وە ئیمامی الطبري تەرجیحی ئەوەی کردووە کە ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێک دابەزیوە کە هەڵگەڕاونەتەوە لە ئیسلام، دوای باسکردنی ووتەی زانایانی سەلەف دەربارەی هۆکاری دابەزینی ئایەتەکە دەڵێ:**

وە نزیکترین ووتە لە پێکان (صواب) لەم ووتانە، ووتەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: ئەم ئایەتە دابەزی بەهۆی خیلافی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی کەسانێک لە خەڵکی مەککە کە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام دوای موسڵمان بوونیان. {تفسير الطبري : 13/8}

**ابن أبي زمنين (رحمه الله) دەربارەی ئایەتەکە دەڵێ:**

ئەوان کەسانێک بوون لە مونافیقەکان دانیشتووی مەدینە بوون دەرچوون بەرەو مەککە پاشان لە مەککە دەرچوون بەرەو یەمامە بە بازرگانی جا هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام و ئەو شیرکەی لە دڵیاندا بوو دەریان خست، جا موسڵمانان پێیان گەیشتن و بوون بە دوو کۆمەڵە دەربارەیان، هەندێکیان ووتیان: خوێنیان حەڵاڵ بووە ئەوانە موشریکی هەڵگەڕاوەن، وە هەندێکیان ووتیان: خوێنیان حەڵاڵ نەبووە ئەوانە کەسانێک بوون فیتنە بەرەو ڕوویان هات، جا الله فەرمووی: ﴿ **فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ** ﴾. {ابن أبي زمنين : تفسير القرآن العزيز} 393/1

**وە کۆمەڵێک لە زانایان تەرجیحی ئەوەیان کردووە کە "عمر بن الخطاب" (رضي الله عنه) وەستا لە تەکفیرکردنی زەکات نەدەران لە سەرەتادا، جا کاتێک "أبو بکر" (رضي الله عنه) کوفری ئەوانی بۆ ڕوونکردەوە، عمر بووە هاوڕای أبو بکر، وە أبو بکر استتابەی عمری نەکرد بەهۆی وەستانی لە تەکفیرکردنی ئەوان.**

**وە بە صەحیحی هاتووە لە "عمر" (رضي الله عنه) کە دەربارەی زەکات نەدەرە مورتەدەکان بە "أبو بکر" (رضي الله عنه) ووتوە: چۆن شەڕ لەگەڵ خەڵکی دەکەیت لەکاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:** (فرمانم پێکراوە شەڕ لەگەڵ خەڵکی بکەم تاوەکو دەڵێن "لا إله إلا الله" جا هەرکەسێک بیڵێت ئەوا ماڵ و گیانی لە دەستم پارێزراو دەبێت تەنها بە حەقی خۆی نەبێت وە حیسابیشی لەسەر الله یە).

{متفق عليه} البخاري : ژ 1884 ، مسلم : ژ 7132

(وەرگێڕ: "تەنها بە حەقی خۆی" واتا زەکاتدان، وە کوشتنی لەکاتی کوشتنی موسڵمانێک بە ئەنقەست یان ڕەجم کردنی پیاو و ژن کە پێشتر زەواجیان کردبێت).

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی ئەوانەی کە وادادەنێن تەتار (مەغۆلەکان) کۆمەڵێکی دەست درێژکەری خاوەن تەئویلن دەڵێ:**

هەرکەسێک وادابنێت ئەوان شەڕیان لەگەڵ دەکرێت هەروەک چۆن کۆمەڵێکی دەست درێژکەری خاوەن تەئویل شەڕیان لەگەڵ دەکرێت، ئەوا هەڵەی کردووە هەڵەیەکی ناشرین، وە گومڕا بووە گومڕاییەکی دور. {مجموع الفتاوى : 541/28}

**وە حوکمدان لەم حاڵەتەدا ئەوەیە:** کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت، وە لە سەرەتاوە تەبدیع ناکرێت، بەڵکو حوکمی لەسەر دەدرێت بەوەی کە هەڵەیە، وە ئەم

حوکمەش لەسەر ئەو بنیات نراوە کە تەکفیرکردن حوکمێکی شەرعیە، وە حوکمی کەسی موجتەهید کە هەڵە دەکات تیایدا وەکو حوکمی بابەتە شەرعیەکانی ترە، بەڵام گەر بەڵگەی بۆ ڕوونکرایەوە و تەئویلی نەما پاش ئەمە هەر بوەستێ لە تەکفیرکردن ئەوا حوکمی کافری بەسەردا دەدرێت.

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

باوەڕبوون بە واجب بوونی واجبە ئاشکرایە موتەواتیرەکان، وە حەڕام بوونی حەڕامە ئاشکرایە موتەواتیرەکان لە گەورەترین ئەصڵەکانی ئیمان و بنچینەکانی دینە، وە ئەوەی ئینکاری بکات کافرە بە یەکدەنگی، وە کەسی موجتەهید لە هەندێکی دا کافر نیە بە یەکدەنگی، بەڵام هەڵەیە. {مجموع الفتاوى : 12/496}

**شێخ سليمان بن سحمان (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

گەر وادانرا یەکێک لە زانایان وەستا لە تەکفیرکردنی کەسێک لەو جاهیلانەی کە تەقلیدکەرەوەی جەهمیەکانن یان ئەو جاهیلانەی کە تەقلیدکەرەوەی گۆڕپەرستانن، ئەوا دەتوانرێ عوزری بۆ بهێنینەوە بەوەی کە هەڵەیە و عوزری هەیە، وە ناڵێی کافرە بەهۆی مەعصوم نەبوونی لە هەڵە، وە ئیجماعی قەطعیش لەم بابەتەدا هەیە.

{كشف الأوهام والإلتباس : لا 70}

***

**پلەی چوارەم: ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە کەوتۆتە ناو جۆرێک لە شیرك یان کوفر کە خیلاف هەیە لەسەر ئەوەی لە دین دەرچووە یان نا، وەکو وازهێنان لە نوێژ یان ئەنجام نەدانی دروشمێک لە دروشمە ئاشکرایە موتەواتیرەکانی ئیسلام، ئەمەش دوو حاڵەتی هەیە:**

**حاڵەتی یەکەم: کەسی وەستاو لە تەکفیرکردن عەقیدەی فاسدە، جا حوکمی لەسەر دەدرێت بەوەی بیدعەچیەکی مورجیئەیە، وە تەکفیر ناکرێت.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی ئەو کەسەی کە ووتویەتی "نوێژنەکەر دەکوژرێ بەڵام هەر موسڵمانە" دەڵێ:**

ئەم بابەتە پێویستی بە لێی ووردبوونەوەیە، هەرکەسێک پەیوەست بوونی ڕووکەش و ناخ بەیەکەوە بزانێت ئەوا گومانی بۆ لادەچێت لەم بابەتەدا، وە دەزانێت کە ئەوانەی لە فەقیهەکان ووتویانە: هەرکەسێک دان بە واجب بوونی نوێژ دابنێت بەڵام ئەنجامی نەدات ناکوژرێت، یان دەکوژرێت بەڵام هەر موسڵمانە، ئەوا هەمان ئەو گومانە چۆتە مێشکیانەوە کە چۆتە ناو مێشکی مورجیئە و جەهمیە، وە چۆتە ناو مێشکی ئەوانەش کە دەڵێن لەگەڵ هەبوونی ویستێکی پتەو و هێزێکی تەواو هیچ کارێک ڕوونادات*، هەر بۆیە ئەو فەقیهانەی ڕێگرن لە کوشتنی نوێژنەکەر ئەم حوکمەیان لەسەر بابەتی ئیمان بنیات ناوە کە ئەویش ئەوەیە کردەوەکان لە ئیمان نین. {مجموع الفتاوى : 616/7}

***(وەرگێڕ: ابن تيمية (رحمه الله) لێرەدا سەرەڕای بەڵگە شەرعیەکان بەڵگەیەکی عەقڵی دەهێنێتەوە لەسەر کافربوونی نوێژنەکەر کە عەقڵی هیچ مرۆڤێکی ژیر ناتوانێت نکۆڵی لێ بکات ئەویش ئەمەیە: هەر کارێک کە مرۆڤ ویستێکی پتەوی لەسەر هەبوو کە ئەنجامی بدات، وە توانایەکی تەواوی هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئەوا بێگومان دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدات، گەر ئەنجامی نەدا مانای وایە کەسەکە ویستی نەبووە بۆ ئەنجامدانی کارەکە یان توانای نەبووە بۆ ئەنجامدانی، نوێژیش بە هەمان شێوە ئەوەی ئەنجامی نادات ویستی نیە ئەنجامی بدات چونکە هەموو کەسێک توانای ئەنجامدانی نوێژی هەیە تەنانەت بە پاڵکەوتن و ئاماژەش ئەنجام دەدرێت، جا کە ویستی نەبوو ئەنجامی بدات ئەوا کافرە، ئەم ووتەیە سودی نادات کە دەڵێ: حەزم لێیە ئەنجامی بدەم بەڵام تەمبەڵم، وە سەیر لەوە دایە هەندێک لە فەقیهەکان دەڵێن: گەر ویستێکی پتەو و توانایەکی تەواو هەموو مەرج نیە هیچ کارێک ڕووبدات !!!).**

**ابن القيم** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

سەیرە گومان دروست ببێت لە کافربوونی ئەو کەسەی کە سوورە لەسەر وازهێنان لە نوێژ، وە لە پێش چاوی خەڵک داوای لێ بکرێت نوێژبکات و شمشێر لەسەر سەری بێت و ببەسترێتە بۆ کوشتن وە چاوەکانی ببەسترێ و پێی بووترێ: نوێژدەکەی یان بتکوژین ؟ ئەویش بڵێ: بمکوژن هەرگیز نوێژ ناکەم، وە ئەو کەسەی تەکفیری نوێژنەکەر ناکات دەڵێ: کەسی نوێژنەکەر ئیماندار و موسڵمانە تەرمەکەی دەشۆردرێ و نوێژیشی لەسەر دەکرێت و لە گۆڕستانی موسڵمانان بە دەشاردرێتەوە ! وە هەندێک دەڵێن: نوێژنەکەر ئیمانداره خاوەن ئیمانێکی تەواوە وەکو ئیمانی جبریل و میکائیل ! جا خاوەنی ئەم ووتەیە شەرم ناکات لەوەی کە ئینکاری لە تەکفیرکردنی کەسێک دەکات کە قورئان و سوننەت و ئیجماعی هاوەڵان شایەتی کافربوونی دەدەن ؟ والله الموفق.

{الصلاة وحكم تاركها : لا 82}

**حاڵەتی دووەم: کەسی وەستاو لە تەکفیرکردن عەقیدەی صەحیحە، جا حوکمی لەسەر دەدرێت بەوەی کە هەڵەی کردووە هیچی تر نا.**

**نموونەش لەسەر ئەمە: هەریەک لە ئیمام الزهري و الشافعي (رَحِمَهُمَا ٱللَّهُ) خاوەنی عەقیدەیەکی صەحیحن لە پێناسەی ئیماندا، لەگەڵ ئەمەشدا کەچی ڕیوایەت کراوە لە (الزهري) کە ووتویەتی: نوێژنەکەر تەکفیر ناکرێت، وە ئیمام (الشافعي) دەڵێ: ئەو کەسەی زەکات نادات و شەڕی لەسەر دەکات بەڵام دان بە واجب بوونی دادەنێت ئەوا مورتەد نیە.**

**لە "ابن شهاب الزهري" ڕیوایەت کراوە کە پرسیاری لێکراوە دەربارەی کەسێک کە واز لە نوێژ دەهێنێت ؟ ئەویش دەڵێ:**

گەر لەبەر ئەمە وازی لە نوێژ هێناوە چونکە دینێکی تری داناوە جگە لە دینی ئیسلام ئەوا دەکوژرێت، وە ئەگەر وانەبێت ئەوا فاسقە لێدانێکی توند و بە ئازاری لێدەدرێت و بەند دەکرێت. {رواه المروزي في تعظيم قدر الصلاة : ب 2/ لا 957/ ژ 1035}

**وە الإمام الشافعي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

هەڵگەڕاوەکان لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) دوو جۆرن: کەسانێک دوای ئیسلام لەخۆبایی بوون وەکو: طليحة و مسيلمة و العنسي و هاوەڵانیان، وە کەسانێک دەستیان گرت بە ئیسلام بەڵام زەکاتیان نەدا، وە ئەگەر کەسک بڵێت بەڵگە لەسەر ئەمە چیە

لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵکی بە مورجئە (هەڵگەڕاوە) ناویان دەبەن ؟ ئیمام الشافعي دەڵێ: ئەمە زمانی عەرەبیە، هەڵگەڕانەوە بریتیە لە هەڵگەڕانەوە بە کوفر لەو شتەی کە لەسەری بوونە، وە هەڵگەڕانەوە بە نەدانی ئەو حەقەی لەسەریانە، وە هەرکەسێک هەڵگەڕێتەوە لەسەر شتێک دروستە بووترێ هەڵگەڕایەوە لەم شتە.
{الشافعي : الأم 227/4}

(وەرگێڕ: مەبەستی "ئیمام الشافعي" ئەوەیە ووشەی هەڵگەڕانەوە بە مانای هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بەکاردێت، وە بە مانای تریش بەکاردێت).

**لەگەڵ ئەمەشدا هیچ یەکێک لە ئیمام (الزهري و الشافعي) بە بیدعەچی ناونەبران، چونکە هەردووکیان فتواکانیان لەم دوو بابەتەدا لەسەر ئەوە بنیات نەناوە کە کردەوە لە ئیمان نیە، بەڵکو دانیان بەوە ناوە کە کردەوە لە ئیمانە.**

**الإمام الزهري** (رحمه الله) **دەربارەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی:** (الله ئاگری دۆزەخی لەسەر ئەو کەسە حەرام کردووە کە دەڵێ: لا إله إلا الله، مەبەستی ڕەزامەندی الله یە لەم ووتەیەدا) **دەڵێ:**

دوای ئەمە واجبەکان و هەندێک شتی تر دابەزین ئیمان بەمانەوە دادەمەزرێت، جا هەرکەسێک دەتوانێت هەڵنەخەڵەتێ با هەڵنەخەڵەتی. {صحيح مسلم : ژ 1442}

**الزهري** (رحمه الله) **دەڵێ:**

"عبد الملك بن مروان" پێی ووتم ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەرکەسێک بمرێت و هیچ هاوبەشێکی بۆ الله دانەنابێت  ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە، ئەگەرچی زینا و دزیشی کردبێت) چۆن لێی تێدەگەی ؟ ووتم: تۆ چۆنی لێ تێدەگەی ئەی ئەمیری ئیمانداران ؟ ئەم فەرموودەیە پێش نەهیەکان و واجبەکان ووتراوە.

{رواه الآجري في الشريعة : ب 2/ لا 687/ ژ 305}

**لە "معقل بن عبيد الله العبسي"ەوە دەڵێ:**

گەیشتم بە "الزهري" ووتەی مورجیئەکانم پێ ووت، ئەویش ووتی: سبحان الله، خەڵکی کەوتەنەتە ناو ئەم باسانەوە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: **(زیناکەر کاتێک زینا دەکات ئیمانی نیە، عەرەق خۆر کاتێک عەرەق دەخواتەوە ئیمانی نیە).**

{رواه عبد الله بن الإمام أحمد في السنة : ب 1/ لا 382/ ژ 831}

(وەرگێڕ: "ئیمام الزهري" مەبەستی ئەوە نیە زیناکەر و عەرەق خۆر کافرن، بەڵکو ئەم فەرموودەیەی هێناوەتەوە وەکو ڕەتدانەوەی مورجیئەکان کە دەڵێن: ئیمانت هەبێ ئەوا گوناهکردن هیچ زیان بە ئیمانەکەت ناگەیەنێت).

**وە الإمام الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئیجماع هەبووە لە هاوەڵان و لەو تابعیانەی دوای ئەوان کە پێیان گەیشتووین لەسەر ئەوەی کە ئیمان ووتە و کردار و نیەتە، هیچ یەکێک لەم سێیانە بەبێ دوانەکەی تر ئیمان دانەمەزرێنێت. {شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة : ب 5/ لا 956/ ژ 1593}

**وە پێویستی لێرە باسی ئەوە بکەین کە هەندێک لە پێشەوایانی سەلەفی صالح تەکفیری (الحجاج بن یوسف الثقفي)یان کردووە بەبێ ئەوەی تەکفیری ئەوانە بکەن کە وەستاون لە تەکفیرکردنی حەججاج، چونکە کەسی وەستاو یان خاوەنی تەئویلە یان ئاگاداری حاڵی نیە.**

**لە الأعمش (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:**

خەڵکی خیلاف تێکەوت دەربارەی کافربوونی حەججاج، ووتیان بە کێ ڕازین کە پرسیاری لێ بکەین ؟ هەندێکیان ووتیان: مجاهد، جا چوونە لای و لێیان پرسی، مجاهد ووتی: پرسیارم لێدەکەن دەربارەی پیرەمێردێکی کافر!؟.

{رواه أبو الفضل الزهري في حديثه - بسند جيد} لا 301/ ژ 274

**لە طاوس (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:**

سەیرم دێت لە براکانمان لە خەڵکی عیراق، بە حەججاج دەڵێن ئیماندار!.

{رواه ابن أبي شيبة في مصنفه - بسند جيد} ب 6/ لا 163/ ژ 30353

**لە إبراهيم النخعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:**

ئەوەندە کوێریە بەسە بۆ کەسێک کە الله کوێری کردبێت لە ئاست کافربوونی حەججاج (لحاه الله). (وەرگێڕ: "لحاه الله" وەکو لعنه الله یان قبحه الله وایە)

{رواه ابن أبي شيبة في مصنفه - بسند صحيح} ب 6/ لا 164/ ژ 30358

**لە الأجلح ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:**

بە (عامر الشعبي)م ووت: خەڵکی وادەزانن حەججاج ئیماندارە، ئەویش ووتی: منیش شایەتی دەدەم کە حەججاج ئیمانی بە طاغوت هەیە و کافرە بە الله.

{رواه ابن أبي شيبة في مصنفه - بسند صحيح} ب 6/ لا 192/ ژ 30597

### وەهەر لە الأجلح ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:

من و عمرو بن قیس الملائي خیلافمان تێکەوت دەربارەی حەججاج، من ووتم: حەججاج کافرە، وە عمرو بن قیس ووتی: حەججاج ئیماندارێکی گومڕایە، جا چووینە لای (الشعبي) پێمان ووت: ئەی باوکی عمرو من ووتم حەججاج کافرە، وە ئەمە ووتی حەججاج ئیماندارێکی گومڕایە، جا الشعبي ووتی: ئەی عمرو قۆڵت هەڵکرد و دامێنت بەردایەوە، ووتت حەججاج ئیماندارێکی گومڕایە، چۆن لە ئیماندارێکدا ئیمان و گومڕایی کۆدەبێتەوە؟ حەججاج باوەڕی بە جیبت و طاغوت هەیە، کافرە بە الله ی گەورە. {رواه ابن أبي الدنيا في الإشراف في منازل الأشراق - بسند ضعيف} لا 137/ ژ 66

### لە سلمة بن كهيل ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:

من و ذر المرهبي خیلافمان تێکەوت دەربارەی حەججاج، ئەو ووتی: ئیماندارە، من ووتم: کافرە. {رواه الحاكم في المستدرك - بسند ضعيف} ب 3/ لا 640/ ژ 6351

**(وەرگێڕ: سلمة بن كهيل و ذر المرهبي هەردووکیان زانا بوونە. کەسیان یەکتریان تەکفیر نەکردووە لەسەر حەججاج).**

### لە غالب القطان ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:

چەند شێخێک لە عەشیرەتی (عبد القيس) منیان بینی و پێیان ووتم: چۆن شایەتی (حوکم) دەدەیت لەسەر (مالك بن المنذر و يزيد بن المهلب و الحجاج بن يوسف) ؟ گەر شایەتی نەدەیت لەسەریان کە ئەوان مونافیقن و بەرینە لە ئیمان و ئەهلی دۆزەخن، ئەوا تۆ گومانت هەیە لە کتێبی الله، جا چوومە لای (الحسن البصري) ووتەی شێخەکانم پێ ووت، حەسەن ووتی: کوڕی برام لەسەرخۆبە لە شایەتیدان (حوکمدان) ئەوەندە بەسە کە دەزانرێ تۆ ئەهلی دینی (زانای) بۆ کەس دروست نیە شایەتی بدات لەسەر تۆ بەوەی کە ئەهلی دۆزەخی، جا چوومە لای (محمد بن سيرين) ووتەی شێخەکانم پێ ووت، پێی ووتم: مالك بن المنذر نزیکترین دراوسێتە و گەورەترین حەقی بەسەرتەوە هەیە، ئایا شایەتی بەسەر دەدەی ؟ فرمانت پێ ناکەم شایەتی بەسەر بدەی، وە يزيد بن المهلب الأزدي خۆت تێهەڵدانی ئەزدییەکان دەزانی گەر دەتەوێ خۆتی توش بکە، وە الحجاج بن يوسف حەججاجی داماو، باوکی محمد داماوەی موحەڕەماتەکانی بەزاند و تاوانی ئەنجامدا، گەر الله سزای بدات ئەوا بەهۆی تاوانەکانیەتی، وە ئەگەر لێی خۆش بێت ئەوا ئێمە حەسودی بە لێ خۆشبونەکەی

نابەین، جا چوومە لای (بكر بن عبد الله المزني) ووتەی شێخەكانم پێ ووت، ووتی: گەر خەڵكی كۆببنەوە ڕۆژی هەینی و پێی بڵێن ئایا دەزانی لەمانە كامەی باشترین كەسە ؟ دەڵێم ئایا دەزانن كامەیان زۆرتر ئامۆژگاری كەریانە ؟ گەر پێم بڵێن ئەو كەسە، گەر بزانم ئەو كەسە وایە ئەوا دەڵێم ئەوە باشترینیانە، وە ئەگەر پێم بڵێن دەزانی لەمانە كامەی خراپترین كەسە ؟ دەڵێم ئایا دەزانن كامەیان زۆرتر فێڵیان لێ دەكات ؟ گەر پێم بڵێن ئەو كەسە، گەر بزانم ئەو كەسە وایە ئەوا دەڵێم ئەوە خراپترینیانە، وە ئەگەر پێم بڵێن شایەتی بدە كە باشترینیان لە ئەهلی بەهەشتە ئەوا شایەتی نادەم، وە ئەگەر بڵێن شایەتی بدە كە خراپترینیان لە ئەهلی دۆزەخە ئەوا شایەتی نادەم، جا گەر هیوای خێرم بە خراپترینیان هەبێت، دەبێت چ هیوایەكم بە باشترینیان هەبێت ؟ وە ئەگەر ترسم لە باشترینیان هەبێت، دەبێت چ ترسێكم لە خراپترینیان هەبێت ؟.

**{رواه حرب الكرماني في مسائل الإمام أحمد - بسند حسن بالمتابعات} 1073/3**

**لە ڕیوایەتێكی تردا:** چوومە لای (بكر بن عبد الله المزني) ئەو شتەم بۆ باسكرد كە بۆ (حەسەنی بەصری و ابن سيرين)م باسكرد، جا ئەویش ووتی: لەناو بابەتەكاندا بابەتی واهەیە گەر ڕاست بكەی تیایدا پاداشت وەرناگری، وە ئەگەر درۆ بكەی تیایدا ئەوا درۆزنی، گەر بڵێی ئەمە كەرە ئەمە ئەسپە هاوشێوەی ئەمانە، ئەوا پاداشت وەرناگریت، وە ئەگەر بە بەرد بڵێی چۆلەكە بە ناوێكی جگە لە ناوی خۆی ناوت لێینا ئەوا تۆ درۆزنی، جا ئاگاداربە لەوەی بە كەسێكی موسڵمان بڵێی كافر یان بە كەسێكی كافر بڵێی موسڵمان. **{رواه الفريابي في القدر - بسند صحيح} لا 256/ ژ 391**

***

**پلەی پێنجەم: ئەوەی وەستاوە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە دراوەتە پاڵ عیلمی شەرعی، بە مەبەستی پاراستنی زانایانی موسڵمانان لە تەکفیرکردن.**

**حوکمی کەسی وەستاو لەم پلەیەدا ئەوەیە کە موجتەهیدێکی پاداشت وەرگرە بە ئیزنی الله تعالی، گەر پێکای دوو پاداشتی هەیە، گەر هەڵەی کرد پاداشتێکی هەیە.**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

پاراستنی زانایانی موسڵمانان لە تەکفیرکردن ئەگەرچی هەڵەشیان کردبێت یەکێکە لە حەقترین مەبەستە شەرعیەکان، تەنانەت پاراستن لە تەکفیرەکە بۆ ئەوە بێت بڕوای وابێت ئەو کافر نیە وەکو پارێزگاریکردن لەو، وە سەرخستنی برا موسڵمانەکەی، ئەمەش مەبەستێکی شەرعی چاکە، وە ئەو گەر ئیجتهاد بکات لەمەدا و بپێکێ ئەوا دوو پاداشتی هەیە، وە ئەگەر ئیجتیهادی تێدا بکات و هەڵە بکات ئەوا پاداشتێکی هەیە. {مجموع الفتاوى : 103/35}

**ابن الوزير الصنعاني** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

چەندە جیاوازی هەیە لەنێوان دەرکردنی هەموو کەسە عەوامەکانی فیرقە ئیسلامیەکان و زۆرینەی ئەو زانایانەی دراونەتە پاڵ ئیسلام لە دینی ئیسلام و زیادکردنی ژمارەی دەرکراوان، وە لەنێوان کردنە ناوەوەی ئەوانە بۆ ناو ئیسلام و سەرخستنی ئیسلام بەمانەوە و زیاکردنی ژمارەی موسڵمانان و بەهێزکردنی ئیسلام، جا دروست نیە کۆشش بکرێ بۆ تەفرەقە ناوەوە بەهۆی زۆر لەخۆ کردن بە تەکفیرکردنی ئەمانە بە بەڵگانێک کە بەڵگەی پێچەوانەی ئەو و بەهێزتر لەو هەیە یان هاوشێوەی ئەو هەیە کە دەبێتە هۆی یەکدەنگی موسڵمانان و ئیسلام بەهێز دەبێت و خوێن نارژێت و زۆرینەی خەڵکی سەقامگیر دەبن، تاوەکو کوفری بیدعەچی ڕوون دەبێتەوە وەکو ڕوون بوونەوەی بەیانی ڕاستەقینە (الفجر الصادق) وە یەکدەنگی لەسەر دروست دەبێت و بە زەرورەت دەزاندرێت. {إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 401}

**ئەمەش تایبەتە بەو زانایانەی کە چاکەکانیان ناوبانگی داوەتەوە، وە مردوونە پێش دەرکەوتن و زاڵبوونی سوننەت و بنبڕکردنی بیدعەی شیرکی، وە بە دڵنیایی نازاندرێ کە لەسەر چ بیروباوەڕێک مردوون، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە حوکمی شیرك و کوفری گەورە نەدەین بەسەر ووتەکانیاندا.**

**الإمام الشوكاني** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

ئەوانەی کە پێش بانگەوازی نەجدی ژیاون وەکو ئەوەی الله تعالی فەرموویەتی: ﴿ **تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلاَ تُسْأَلُونَ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ** ﴾ [البقرة : 134]، واتا: (ئەمە قەومێک بوو ڕۆیشت ئەوەی ئەنجامی داوە دێتەوە ڕێگای، وە ئێوەش چی ئەنجام بدەن دێتەوە ڕێگاتان، وە پرسیارتان لێ ناکرێت دەربارەی قەومانی پێش خۆتان کە چیان کردووە)، وە داوامان لێنەکراوە کە بیروباوەڕیان بزانین، هەر ووتەیەکی ئەوان ببینین کە شیرك بێت ئەوا شیرکە جا هەرکەسێک ووتبێتی، وە ناڵێین خاوەنی ووشەکە موشریکە بەڵکو گومانی باشی پێ دەبەین لەوانەیە تەوبەی لێ کردبێت پێش مردنی یان لێی پەشیمان بووبێتەوە، وە ناگەڕێینەوە سەر زۆر لەخۆکردن و تەئویل هێنانەوە بۆ خاوەنی ووتەکە تاکو بڵێین شیرکی گەورە نیە، بەڵکو دەڵێین شیرکی گەورەیە. {الفتح الرباني : 47/1}

**شێخ عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

ئێمەش بە هەمان شێوە ناڵێین ئەو کەسە کافرە کە دینداریەکی چاکی هەبووبێت، وە چاکەکانی ناوبانگی دەرکردبێت، وە وەرع و زوهدی زانراوبێت، وە ژیاننامەی جوان بێت، وە ئامۆژگاریەکانی گەیشتوون بە ئوممەت بەهۆی تەرخانکردنی ژیانی بۆ ووتنەوەی وانەی بە سوود و کتێب نوسین تیایدا، ئەگەرچی هەڵەشی کردبێت تیایدا یان لە بابەتەکانی تردا. {الدرر السنية : 236/1}

**وە هەندێک لە زانایان وەستاون لە تەکفیرکردنی صۆفیە زیادەڕەوەکان بەهۆی هەبوونی ئەگەری تەوبەکردنیان پێش مردن، لەگەڵ داننان بەوەی کە ئەو ووتانەی لەوانە نەقڵ کراوە لە شیرك خراپترە، جا ئەوەی ووتەی لەمە کەمتر خراپەی هەبێت دەبێت چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەن ؟**

**الإمام الذهبي** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

ئەگەرچی ئێمە حوکم نادەین لەسەر خودی ئەمانە بە ئیمان و کوفر، بەهۆی هەبوونی ئەگەری تەوبەکردنیان پێش مردن، وە حاڵیان ناڕوونە و حیسابیان لەسەر الله یە، بەڵام ووتەکانیان گومانی تێدانیە کە لە شیرك خراپترە، جا ئەی براکەم وە ئەی خۆشەویستەکەم تیروکەوان بدە دەستی ئەو کەسە کە لێی دەزانێت، وازم لێبێنە وە واز لە زانینی من بێنە دەربارەی ئەمە، چونکە من دەترسم الله سزام بدات لەسەر

بێدەنگ بوونم هەروەک چۆن دەترسم سزام بدات لەسەر قسەکردنم دەربارەی وەلیەکانی الله، وە ئەگەر من بە کەسێکی موسڵمان بڵێم: ئەی کافر، ئەوا کوفرم بۆخۆم گەڕاندۆتەوە، ئەی چۆن دەبێت گەر بە کەسێکی چاکی بڵێم یان وەلیەکی الله.
{تاريخ الإسلام : 138/15}

**وە ئاگاداری دەدەین لەسەر ئەوەی کە ئەم ووتانە زانای طاغوتەکان ناگرێتەوە، وە بلعام بن باعورائەکانی سەردەم ناگرێتەوە لە دوورگەی عەرەبی و مصر و وولاتانی تردا، ئەو زانایانەی کە وەلائیان بۆ طاغوتەکانی عەرەب و عەجەب هەبوو بۆ جەنگان لە دژی موجاهیدان، وە دەستکاری حوکمە شەرعیەکانیان کرد، جا ئەمانە هیچ گومان نیە لە کافربوونیان، بەڵکو گومان نیە لە کافربوونی ئەوانەش کە وەستاون لە تەکفیرکردنیان دوای ڕوونکردنەوەی حاڵیان، وبالله التوفيق.**

## بابەتێک دەربارەی پلەی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی گۆڕپەرستان:

**پلەی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی گۆڕپەرستان دەگۆڕێت بەگوێرەی ئاشکرایی شیرکەکە یان بیروباوەڕ دەربارەی خاوەنی گۆڕەکە، وە گومانی تێدانیە هی وای تێدایە کە هاوشێوەی بت پەرستنە یان زیاتریشە، وە تێیدایە کە لەمە نزمترە، وە تێیدایە کە تەنها بیدعەیەکە لە دین ناگات بە کوفر.**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

**پلەکان لەم بابەتەدا سێ پلەیە:**

**یەکەمیان:** بانگی غەیری الله بکات مردووێک بێت یان کەسێکی موجود نەبێت، جیاوازی نیە چ لە پێغەمبەران بێت یان لە چاکەکاران بێت یان لە غەیری ئەوان، جا دەڵێ: ئەی گەورەم فلان کەس بە هانام وەرە یان دەڵێ: من لە پەنای تۆدا خۆم دەپارێزم، یان دەڵێ: داوای بە هاناوەچوون لە تۆ دەکەم، یان دەڵێ: سەرم بخە بەسەر دوژمنەکەم، وە هاوشێوەی ئەم ووتانە، جا ئەمە هاوبەش دانانە بۆ الله.

لەمەش گەورەتر ئەوەیە کە بڵێ: لێم خۆشبە و تەوبەم لێ قبوڵ بکە، هەروەک چۆن کۆمەڵێک لە جاهیلە موشریکەکان وادەکەن.

وە لەمەش گەورەتر ئەوەیە کە سوجدە بۆ گۆڕەکەی ببات و نوێژی بەرەو ڕووی گۆڕەکەی بکات، وە وادابنێت کە ئەم نوێژە باشترە لە ڕووکردنە قیبلە، تەنانەت

هەندێک دەڵێن: ئەم گۆڕانە قیبلەی زانا تایبەتەکانن، وە کەعبەش قیبلەی گشت عەوامەکانە.

وە لەمەش گەورەتر ئەوەیە کە وادابنێ سەفەرکردن بۆ لای گۆڕەکان وەکو حەج کردن وایە، تاوەکو دەڵێ: سەفەر کردن بۆ ئەم گۆڕانە چەند جارێک یەکسانە بە حەج، وە زیادەڕەوەکانیان دەڵێن: یەکجار سەردانیکردنی ئەم گۆڕانە باشترە لە چەندەها جار حەج کردنی ماڵی الله، وە هاوشێوەی ئەم ووتانە، جا ئەمە شیرکە ئەوانەی تێکەوتووە ئەگەرچی زۆرینەی خەڵکی دەکەونە ناو هەندێکیەوە.

**دووەمیان:** بە کەسی مردوو یان کەسی موجود نەبوو لە پێغەمبەران و چاکەکاران بڵێ: لە الله بپاڕێوە بۆم، یان لە پەروەردگارت بپاڕێوە بۆمان، یان داوا لە الله بکە بۆمان، هەروەک چۆن نەصارا ئاوا بە مەریەم و غەیری مەریەمیش دەڵێ، ئەمەش هیچ زانایەک گومانی تێدانیە کە جائیز نیە، وە ئەمە لەو بیدعانەیە کە هیچ یەکێک لە سەلەفی ئوممەتی ئەنجامی نەداوە.

جا زانرا کە دروست نیە داوای هیچ شتێک لە مردوو بکرێت، داوای لێ ناکرێت کە بپاڕێتەوە لە الله بۆی وە شتی تریش جگە لەمە، وە دروست نیە شکاتی هیچ ناخۆشیەکانی دونیا و دینی بباتەوە لای، وە ئەگەر دروست بێت شکاتی حاڵی بباتە لای لەکاتی ژیانیدا ئەوا لەکاتیدا ژیانیدا بەرەو شیرکی نابات، بەڵام ئەمە (کە دوای مردنە) بەرەو شیرکی دەبات.

**سێیەمیان:** بڵێ: خوایە داوات لێ دەکەم بە فلان کەس یان بە پلە و پایەی فلان کەس لەلات وە هاوشێوەی ئەم ووتانە، جا ئەمانە نەهی لێکراوە.

**{مجموع الفتاوى : 350/1} بە دەستکارییەوە**

**(وەرگێڕ: جۆری دووەمیان زۆر ووردە لەنێوان بیدعە و شیرکدا، لەوانەیە کەسی نەزان ئەمە بە شیرك دابنێت و بەهۆی ئەم ووتەیەوە "ابن تيمية" تەکفیر بکات، بەڵام ئەوەی زیرەک بێت جیاوازی جۆری یەکەم و دووەم دەزانێت).**

**بەڵام ئەوەی دەوەستێ لە تەکفیرکردنی موشریکان بەهۆی بەڕاست دانانی بیروباوەڕیان، ئەوا ئەم کەسە وەکو ئەوان موشریکە، وە کوفرەکەی لە لایەنی هەڵوەشاندنەوەی ئەصلی دینە نەوەک لە لایەنی ڕەتکردنەوەی حوکمە شەرعیەکان و ئینکارکردنیان، هەر بۆیە لەم پلەیانە باسمان نەکرد.**

***

# بەشی دووەم

## تەواوکەری هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم

**بابەتی یەکەم:** ووتەی زانایان دەربارەی تەواوکەری هەڵوەشـــێنەرەوەی سێیەم.

**بابەتی دووەم:** بەڵگەکان لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە موسڵمانێکی تەکفیرکردووە بە ناحەق.

**بابەتی ســـێیەم:** هۆکاری کافربوونی ئەو کەســـەی کە موســـڵمـانێکی تەکفیرکردووە بە ناحەق.

**بابەتی چوارەم:** پلەی دەست هەڵگرتن لە تەکفیرکردنی موسڵمانان لە دیندا.

**بابەتی پێنجەم:** پلەی ئەو کەسـانەی کە موسـڵمانێکیان تەکفیرکردووە وە حوکمەکانیان.

# بابەتی یەکەم

## ووتەی زانایان دەربارەی تەواوکەری هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم

ووتەی زانایان جیاوازە لە باسکردنی کافربوونی ئەو کەسەی کە موسڵمانێک بە ناحەق تەکفیر دەکات، هەیانە بە ڕەهایی باسیکردووە، وە هەیانە ئەوانەی تەکفیرکردووە کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکەن، وە هەیانە ئەوانەی تەکفیرکردووە کە کۆمەڵی ئەهلی سوننە و جەماعە یان عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکەن، وە هەیانە ئەوانەی تەکفیر کردووە کە چەند کەسێکی دیاریکراو لە موسڵمانان تەکفیر دەکەن، وە هەیانە ئەوانەی تەکفیر کردووە کە موسڵمانێک تەکفیر دەکەن بەهۆی صەحیحی عەقیدەکەی، وە لەمەی خوارەوەدا ئەم ووتانەیان باس دەکەین کە لەسەری وەستاوین:

### یەکەم: ئەوەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیەی کردووە بە ڕەهایی.

**1. الإمام البخاري (رَحِمَهُ اللَّهُ) لە صەحیحیەکەیدا دەڵێ:**

بەشی: ئەوەی برا موسڵمانەکەی تەکفیر بکات بەبێ تەئویل ئەوا خۆی کافرە.

{صحيح البخاري : 26/8}

**2. الإمام ابن حبان (رَحِمَهُ اللَّهُ) لە صەحیحەکەیدا دەڵێ:**

بەشی: ڕوونکردەوەی ئەوەی کە هەرکەسێک مرۆڤێک (موسڵمانێک) تەکفیر بکات، ئەوا خۆی کافرە هیچ مەحاڵ نیە. {صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان : 483/1}

**3. المازري (رَحِمَهُ اللَّهُ) باسی ئەوەی کردووە:**

هەرکەسێک بە موسڵمانێک بڵێ کافر، وە پێی حەڵاڵ بێت، ئەوا کافر دەبێت.

{المعلم بفوائد مسلم : 295/1}

**4. ابن الأثير (رَحِمَهُ اللَّهُ) لە ووشەی (كَفَرَ)دا دەڵێ:**

فەرموودەی تێدایە: (من قال لأخيه يا كافر فقد باء به أحدهما) واتا: هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ کافر ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە)، چونکە یان ڕاست دەکات یان درۆ دەکات، گەر ڕاستی کرد ئەوا کافرە، وە ئەگەر درۆی کرد ئەوا کوفرەکە بۆخۆی دەگەڕێتەوە بەهۆی تەکفیرکردنی برا موسڵمانەکەی.

{النهاية في غريب الحديث والأثر : 185/4}

### 5. المتولي الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

گەر موسڵمانێک بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل، ئەوا کافر دەبێت چونکە ناوی لە ئیسلام ناوە کوفر. {روضة الطالبين : 65/10}

### 6. الرافعي لە کتێبی "الشرح الكبير"دا دەڵێ:

گەر بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل، ئەوا کافر دەبێت چونکە ناوی لە ئیسلام ناوە کوفر. {العزيز في شرح الوجيز : 98/11}

### 7. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

تەکفیرکردنی ئیماندار کوفرە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: گەر کەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ کافر، ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە.

{منهاج السنة النبوية : 505/4}

### 8. الإمام الذهبي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

من گەر بە کەسێکی موسڵمان بڵێم (ئەی کافر) ئەوا کوفرەکەم بۆخۆم گەڕاندۆتەوە، ئەی ئەگەر بە کەسێکی چاک یان وەلیەکی الله بڵێم کافر دەبێت چۆن بێت !؟.

{تاريخ الإسلام : 168/15}

### 9. ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

ئەم فەرموودەیە موتەواتیرە لەلای ئەهلی لێکۆڵینەوە لە سەنەدەکانی فەرموودەکە، تاوەکو موتەواتیر بوو کە ئەمە کوفرە. {إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 380}

### 10. أبو بكر الحصني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

گەر بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل، ئەوا کافر دەبێت چونکە ناوی لە ئیسلام ناوە کوفر. {كفاية الأخيار : لا 494}

### 11. أبو البقاء الدميري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

ئەو کەسە کافر دەبێت کە بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل.

{النجم الوهاج : 80/9} بە دەستکارییەوە

### 12. ابن فقيه فصة (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک تەکفیری کەسێک بکات کە کافر نەبێت وە بڕوای وابێت کافرە، ئەوا خۆی کافر دەبێت، وە هەرکەسێک تەفسیقی کەسێک بکات کە فاسق نەبێت وە بڕوای وابێت فاسقە، ئەوا خۆی فاسق دەبێت. {العين والأثر في عقائد أهل الأثر : لا 50}

**دووەم: ئەوەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەی کردووە دەربارەی ئەو کەسانەی کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکەن.**

**1. عبد القاهر البغدادي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک موسڵمانان تەکفیر بکات، وە چاکترین هاوەڵان تەکفیر بکات، ئەوا کافرە.

{الفرق بين الفرق : لا 343}

**2. القاضي عياض (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک قسەیەک بکات قسەکەی بگاتە ئەوەی کە هەموو ئوممەت بە گومڕا دابنێت، وە هەموو هاوەڵان تەکفیر بکات. ئەوا کوفری خاوەنی قسەکە بڕاوەیە لەلامان. {الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 286/2}

**3. وەهەر القاضي عياض دەربارەی ئەوانەی کە سەدەی یەکەمی ئوممەت تەکفیر دەکەن دەڵێ:** گومان لە کافربوونی خاوەنانی ئەم ووتەیەدا نیە، چونکە هەرکەسێک هەموو ئوممەت تەکفیر بکات وە سەدەی یەکەمیش، ئەوا نەقڵ کردنی شەریعەتی پوچەڵ کردۆتەوە و ئیسلامی ڕماندووە. {إكمال المعلم : 412/7}

**4. النووي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک قسەیەک بگات قسەکەی بگات بە ئەوەی هەموو ئوممەت بە گومڕا دابنێت یان تەکفیری هاوەڵان بکات، ئەوا کوفری خاوەنی قسەکە بڕاوەتەوە.

{روضة الطالبين : 70/10}

**5. الحجاوي باسی ئەوەی کردووە:**

هەرکەسێک قسەیەک بکات قسەکەی بگات بە ئەوەی هەموو ئوممەت بە گومڕا دابنێت یان هاوەڵام تەکفیر بکات، ئەوا خاوەنی قسەکە کافرە. {الإقناع : 298/4}

**6. الإمام الشوكاني (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک تاکە موسڵمانێک تەکفیر بکات ئەوا دەبێتە کافر بە دەقی سوننەتی پاک، ئەی چۆن دەبێت گەرکەسێک هەموو موسڵمانان تەکفیر بکات !؟.

{إرشاد الغبي : لا 16}

***

**سێیەم: ئەوەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیەی کردووە دەربارەی ئەو کەسانەی کە ئەهلی سوننە و جەماعەت یان عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکەن.**

**1. الملا علي القاري (رحمه الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک بڕوای وابێت هاوەڵان و ئەهلی سوننە کافرن، ئەوا کافرە بە ئیجماع.

**{شم العوارض في ذم الروافض : لا 19} بە دەستکارییەکی کەم**

**2. ابن الوزير الصنعاني (رحمه الله) دەڵێ:**

تەکفیرکردنی عەوامی موسڵمانان لەبەر ئەوەی (الله)یان نەناسیوە بە بەڵگەیەکی براوە لەسەر مەرجی ئەهلی عیلمی کەلام، ئەوا کافربوونی ئەوانەی تەکفیریان دەکەن بەهێزتر دەکات، چونکە حوکمدان بەسەریان بە ئیسلامەتی شتێکی زەرورەتی زانراوە لە دیندا، وە تەکفیرکردنیان ئینکاری کردنی ئەم زەرورەتە زانراوەیە.

**{إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 392}**

**(وەرگێڕ: ئەهلی کەلام – ئەشعەری و موعتەزیلی و ماتوریدی و...هتد – ئەوانەن کە لە بابەتە عەقیدەییەکان پشت بە بەڵگەی عەقڵی دەبەستن، هەندێکیان تەکفیری ئەو کەسە عەوامانە دەکەن کە لەسەر مەرجەکانی ئەوان نین بۆ ناسینی "الله" ابن الوزير یش تەکفیری ئەمانە دەکات).**

***

**چوارەم: ئەوەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەی کردووە دەربارەی ئەوانەی کە هەندێک کەسی دیاریکراوی موسڵمانان تەکفیر دەکەن.**

**1. ابن حزم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک شیرك و کوفر بداتە پاڵ ئادەم (عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ) ئەوا ئەم کارەی کوفرێکی تەواوە خیلافی تێدانیە لەلایەن هیچ کەسێکی ئوممەت، وە ئێمە سەرزەنشتی ئەوانە دەکەین کە تەکفیری ئەو موسڵمانە تاوانبارانە دەکەن کە باج بە ناحەق وەردەگرن و بکوژن، وە تەکفیری پۆلیسە فاسقەکان دەکەن، ئەی چۆن دەبێت گەر کەسێک پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ ٱلسَّلَامُ) تەکفیر بکات !؟. {الفصل في الملل والأهواء والنحل : 4/4}

**2. وەهەر ابن حزم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک پێغەمبەرێک تەکفیر بکات، ئەوا کافر دەبێت.

{الفصل في الملل والأهواء والنحل : 6/4}

**3. ابن العطار الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

بزانە هەرکەسێک پێغەمبەرێک یان هاوەڵێک یان وەلیەک لە وەلیەکانی الله یان یەکێک لە (آل البیت)ی پێغەمبەر (ﷺ) یان ژنەکانی تەکفیر بکات یان بە گومڕایان دابنێت، ئەوا بێگومان بەمە کافر دەبێت. {الإعتقاد الخالص من الشك والإنتقاد : لا 278}

**4. ابن الوزير الصنعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک فریشتەیەک تەکفیر بکات، ئەوا کافر دەبێت.

{إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 384}

**5. أبو الحسين الملطي الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لە ڕەتدانەوەی ئەو کەسەی کە هەموو هاوەڵان تەکفیر دەکات تەنها چوار هاوەڵان نەبێت دەڵێ:**

کێ ئەم شتەی پێ ووتی ؟ چ علمێک ئەمەی باسکردووە ؟ چ شتێک هۆکارە بۆ ئەمە جگە لە هەوا و ئارەزو و کوفرێکی صاف ؟ وإنا لله وإنا إليه راجعون.

{التنبيه والرد على أهل الأهواء والبدع : لا 13}

**6. الإمام السمعاني (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئوممەت یەکدەنگ بوونە لەسەر تەکفیرکردنی شیعەی ئیمامی، چونکە ئەوان باوەڕیان وایە هاوەڵان گومڕابوونە، وە ئینکاری ئیجماعی هاوەڵان دەکەن و شتانێکیان

دەدەنە پاڵیان کە شایستە نیە بەوان. {الأنساب : 188/3}

**7. أبو حامد الغزالي دەربارەی ئەو کەسەی کە بە ڕاشکاوی تەکفیری "أبو بكر و عمر" دەکات (رضي الله عنهما) دەڵێ:** دەربارەی موژدە پێدانیان بە بەهەشت و ستایش کردنیان و حوکمدان بە ڕاستی و دروستی دینداریيان و ڕاگیراوی یەقینیان و پێشخستنیان لەسەر تەواوی ئوممەت فەرموودە و ئەثەری زۆر هاتوون، جا ئەوەی تەکفیریان دەکات گەر ئەم هەواڵانەی پێگەیشتبێت لەگەڵ ئەمەشدا بڕوای وابێت کافرن، ئەوا ئەو کەسە کافرە. {فضائح الباطنية : لا 149}

**8. شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی ئەو کەسەی کە هاوەڵان (رضي الله عنهم) تەکفیر دەکات دەڵێ:** هەرکەسێک ئەمە بە دروست بزانێت تا بگاتەوە ئەوەی وادابنێت ئەوان هەڵگەڕاونەتەوە لە دین دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەنها چەند کەسێکی کەمیان نەبێت کە ناگەنە دە – بیست کەسێک، وە هەموویان فاسق بوونە، جا ئەمە گومانی تێدانیە کە کوفرە، چونکە بە درۆخەرەوەی دەقی قورئانە کە لە چەندەها ئایەت باسی ڕەزامەندی الله دەکات بۆیان وە ستایش کردنیان، بەڵکو هەرکەسێک گومانی هەبێت لە کافربوونی ئەم کەسە ئەوا خودی خۆشی کافرە.

{الصارم المسلول : لا 586}

**9. تقي الدين السبكي (رحمه الله) دەڵێ:**

هەرکەسێک لە خەواریج ئەوەی لەسەر بچەسپێ کە تەکفیری یەکێک لەو دە هاوەڵە دەکات کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موژدەی بەهەشتی پێداون یان جگە لەوانیش کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، ئەوا کافرە. {فتاوى السبكي : 571/2}

**10. الخرشي (رحمه الله) دەڵێ:**

ئەو کەسە کافر دەبێت کە هەموو هاوەڵان تەکفیر دەکات، چونکە ئینکاری شتێکی کردووە کە زانراوە بە زەرورەت لە دیندا، وە الله و پێغەمبەرەکەی بە درۆخستۆتەوە. {شرح مختصر خليل : 74/8}

**11. الإمام الشوكاني (رحمه الله) دەڵێ:**

هەموو ڕافیزەیەکی پیس لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا کافر دەبێت بەهۆی تەکفیرکردنیان بۆ یەک هاوەڵ، چونکە هەر یەکێک لەوان ئەو هاوەڵەیان تەکفیرکردووە، ئەی چۆنە

گەر کەسێک هەموو هاوەڵان تەکفیر بکات تەنها چەند ژمارەیەکی کەم نەبێت ئەویش بۆ ڕەواجدانیەتی بەو گومڕاییەی کە تێیدایە لەلای خەڵکی گەمژە.

{الفتح الرباني : 5442/11} نامەی (نثر الجوهر على حديث أبي ذر)

**12. الألوسي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەربارەی ئەو کەسەی کە هاوەڵان تەکفیر دەکات دەڵێ:**

زانایانی هەر چوار مەزهەبی حەنەفی و مالکی و شافعی و حەنبەلی یەکدەنگن لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە ئەمە وەصفی بێت.

{الأجوبة العراقية على الأسئلة اللاهورية : لا 49}

**13. ابن عابدين دەڵێ:**

هەرکەسێک بڕوای وابێت هاوەڵان کافرن، ئەوا کافرە بە ئیجماع.

{رد المحتار على الدر المختار : 162/7}

**14. تقي الدين السبكي دەربارەی ئەو زانایانەی ئوممەت کە ئیجماع دامەزراوە لەسەر پێشەوایەتیان دەڵێ:** گومانمان نیە لە ئیمانیان، هەرکەسێک تەکفیریان بکات کوفرەکەی بۆخۆی گەڕاندۆتەوە، وە بە دووری نازانم کە بڵێم: تانەدان لەمانە تانەدانە لە دین، مەبەستم شافعی و مالك و هاوشێوەکانیانە هاوەڵانیش زیاتر لەمانە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) جا ئیجماعی خەڵکی لەسەر پێشەوایەتی ئەمانە دەیان خاتە ناو بازنەی ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ: (ئەوەی تەکفیریان بکات کوفرەکە بۆخۆی دەگەڕێتەوە). {فتاوى السبكي : 571/2} بە دەستکارییەوە

**15. وەهەر تقي الدين السبكي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

تەکفیری ئەو کەسە دەکەین کە تەکفیری کەسێک بکات کە ئیمانی بڕابێتەوە لەلامان یان بە دەق یان بە ئیجماع. {فتاوى السبكي : 586/2}

**16. القاضي ابن الحمصي (رَحِمَهُ اللَّهُ) لە ڕەتدانەوەی ئەو کەسەی کە فتوای داوە بە موڕتەد بوونی شێخی ئیسلام ابن تيمية (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

نعم نكفر من أفتى بردتـــــــــه *** بغير تأويل إذ يفضي إلى العطـــــــــــب

وصح من سنة المختار سيدنـــــــا *** معنى حديث البخاري ثم ذي الكتـــــــــب

لا يرمين رجل منكم لصاحبـــــــه *** بالـكـفـر يـكـفــر إن لم ردة تــجـــــــــب

فيا أئمة دين الله هل أحـــــــــد *** يرضيـه قــول بكفــر العـالـم الــــــدرب

تحتم الفحص والدعوى على رجل *** أفتى بكفر بأن يلجى إلى السبــــــــــب

فإن أقام دليلا قاطعا عجبـــــا *** فـذاك أو ذا احـتمال فـيه فاستتـــــب
أو لم فكفره واحكم إذ تنقصـــه *** تـعزيـره بسـيـاط أو بـــــــذي الأدب
وإن تخفف بسجن فاضربن لـــه *** طـويـل وقت إلى شعبان أو رجـــــب
لردع أمثاله والمقدمين عـــــلى *** مـقالـه تبعـا تقليـد مصـطحـــــب
فما يضربنا غير التساهل فـــي *** أمــر كهذا وقــول العــاذل النــــدب
إن تنصروا الله ينصركم ويخذلهم *** وإن عــفوتـم فـلا لوم لمعتقـــــب
مـا يسـلم الشـرف الأعـلى لمتـنـا *** حتى يـراق دم أو ضرب مرتكـــــب

**{تكملة الجامع لسيرة شيخ الإسلام ابن تيمية خلال سبعة قرون : لا 126} به دەستكاریيەوە**

**(وەرگێڕ: پوختەی ووتەکانی شاعیر ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو کەسەی فتوای داوە مورتەد بوونی "ابن تيمية" ئەوا خۆی مورتەد بۆتەوە بەگوێرەی ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ کافر ئەوا کوفرەکە بۆخۆی دەگەڕێتەوە، وە ئەگەر تەکفیریشی نەکات بەڵام سوکایەتی پێ بکات و لە پلەی کەم بکاتەوە ئەوا پێویستە بە لێدان تەمبێ بکرێت یان بەند بکرێ بۆ ماوەی چەند مانگێک تاوەکو ببێتە پەند بۆ هاوشێوەکانی).**

**(وەرگێڕ: ابن ناصر الدين الدمشقي ئەم کتێبەی نوسیوە بۆ ڕەتدانەوەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن: هەرکەسێک بە ابن تيمية بڵێ "شيخ الإسلام" ئەوا کافرە، بۆیە ناوی لە کتێبەکەی ناوە "الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية شيخ الإسلام كافر").**

***

**پێنجەم: ئەوەی باســی ئەم هەڵوەشــێنەرەوەیەی کردووە دەربارەی ئەو کەســـانەی کە موســڵمانێک تەکفیر دەکەن بەهۆی عەقیدە صەحیحەکەیەوە.**

**1. أبو جعفر الطحاوي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک بە هاوڕێکەی بڵێ (ئەی کافر) مانای وایە هاوڕێکەی کافرە چونکە ئەوەی هاوڕێکەی لەسەریەتی کوفرە، جا ئەگەر ئەوەی هاوڕێکەی لەسەری بوو کوفر نەبوو بەڵکو ئیمان بوو، ئەوا ئەوەی تەکفیری کرد ئیمانی بە کوفر داناوە، بەمەش کافر دەبێت بە الله تعالى، چونکە هەرکەسێک کافر بێت بە ئیمان ئەوا کافر بووە بە الله.

{شرح مشكل الآثار : 325/2}

**2. أبو سليمان الخطابي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) "ئەگەر کەسێک بە براکەی ووت ئەی کافر، ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە"، ئەمە بە مەرجێکە ئەگەر ئەوەی ئەم قسەیە دەکات قسەکەی لە هیچ لایەنێک تەئویل هەڵی نەگرێت، جا لەم کاتەدا هیچ شتێک نامێنێتەوە بۆی ببێتە عوزر، جا ووتەکەی وا لێکدەدرێتەوە کە ئەو موسڵمانێکی بە کافر زانیوە، وە وادەزانێت دینی ئیسلام کە حەقە دینێکی باطلە، جا ئەمە کوفری خاوەنی ووتەکەی لێدەکەوێتەوە، بەو مەرجەی ئەو کەسەی کە پێی وترا کافر هیچ شتێکی کوفری تێدا نەدۆزرێتەوە. {أعلام الحديث : 177/1}

**3. الحليمي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئەگەر موسڵمانێک بە موسڵمانێک بڵێ: (ئەی کافر)، ئەوا ئەمە دوو جۆرە: گەر مەبەستی ئەوەبێت کە ئەو دینەی ئەو باوەڕی پێیەتی کوفرە، ئەوا کافر دەبێت، وە ئەگەر مەبەستی ئەوەبێت کە ئەو لە ناخەوە کافرە بەڵام بە ڕووکەش خۆی بە ئیماندار نیشان دەدات وەکو دووڕوویی، ئەوا کافر نابێت. {المنهاج في شعب الإيمان : 143/1}

**4. ابن رشد الجد (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

گەر بە ئیماندارێک بڵێ (ئەی کافر) باوەڕی وابێت کە ئەو ئیمانەی ئەوی لەسەرە کوفرە، ئەوا خۆی کافر دەبێت بەهۆی ئەوەی کە ئیمانی هاوڕێکەی بە کوفر دانا.

{البيان والتحصيل : 173/9} (وەرگێڕ: "ابن رشد الجد" و "ابن رشد الحفيد" هەیە).

**5. أبو حامد الغزالي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات دەڵێ:** گەر بزانێت بیروباوەڕی ئەو تەوحید و باوەڕبوون بە پێغەمبەر (ﷺ) و تاکو دەگاتە هەموو بیروباوەڕە صەحیحەکان، جا هەرچۆنێک تەکفیری بکات بەم بیروباوەڕانەوە ئەوا خۆی کافرە، چونکە دینی حەق بە کوفر و باطل دەزانێت.
{الفضائح الباطنية : لا 150}

**6. شێخ محمد بن عبد الرحمن البغدادي المالكي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەربارەی ڕەتدانەوەی ئەو کەسەی کە تەکفیری ئەوانەی کردووە کە دەڵێن حەرامە خۆت کۆبکەیتەوە بۆ سەردانیکردنی گۆڕەکان دەڵێ:**
هەرکەسێک لە وەڵامدانەوەی ئەم بابەتە ووتبێتی: ئەمە سەفەرێکی نەهی لێکراوە، جائیز نیە کوفری بدرێتە پاڵ، جا هەرکەسێک بەهۆی ئەم وەڵامەوە تەکفیری بکات بەبێ ئەوەی هیچ هۆکارێکی کافربوون هەبێت، گەر ئەمە بە حەڵاڵ بزانێت ئەوا کافر دەبێت، وە ئەگەرنا فاسق دەبێت. {نقله ابن عبد الهادي في العقود الدرية : لا 363}

**7. شێخ عبد اللطيف بن عبد الرحمن آل الشيخ (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**
هەرکەسێک موسڵمانانی ئەهلی تەوحید تەکفیر بکات، یان توشی شەڕ و سزادانیان بکات، ئەوا ئەو کەسە لە خراپترین جۆری کافرانە.
{عيون الرسائل والأجوبة على المسائل : 959/2}

**8. البكري الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) چەند جۆرێکی هەڵگەڕانەوەی باسکردووە لەمانە:** بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) یان (بێ دین)، لە هی یەکەم مەبەستی ئەوە بێت ئەو دینەی ئەوی تێدایە کە ئیسلامە، کوفرە، وە لە هی دووەم مەبەستی ئەوە بێت ئەو دینەی ئەوی پێ وەصف کراوە کە ئیسلامە، دین نیە. {إعانة الطالبين : 149/4}

***

# بابەتی دووەم

## بەڵگەکان لەسەر تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە موسڵمانێکی تەکفیرکردووە بە ناحەق

له بابەتی پێشوودا باسمان کرد کە ووتەی زانایان جیاوازە لە باسکردنی کافربوونی ئەوەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق، جا باسمان کرد کە هەیانە بە ڕەهایی باسی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کردووە کە موسڵمانێک تەکفیردەکات، وە هەیانە باسی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کردووە کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکات یان کۆمەڵی ئەهلی سوننە و جەماعەت بە تایبەتی، وە هەیانە باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە چەند کەسێکی دیاریکراو تەکفیر دەکات وەکو: پێغەمبەران (عليهم السلام) و هاوەڵان (رضي الله عنهم) و زانایانی ئوممەت کە ئیجماع هەیە لەسەر گەورەییان، وە هەیانە باسی تەکفیری ئەو کەسەی کردووە کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بەهۆی عەقیدە صەحیحەکەیەوە.

جا لەبەر ئەمە بەڵگەی زانایان جیاوازە دەربارەی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیە بەگوێرەی ئەو حاڵەتەی کە باسیان کردووە، لەمەی خوارەوەدا هەندێک لەم بەڵگانە باس دەکەین کە ڕیزبەندی کراوە بەگوێرەی ئەوەی باسمان کرد لە بابەتی پێشوودا دەربارەی ووتەی زانایان لەسەر ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق.

### یەکەم: بەڵگەی ئەو کەسەی باسی ئەم هەڵوەشێنەرەوەیەی کردووە بە ڕەهایی.

**1. لە "عبد الله بن عمر"ەوە (رضي الله عنهما) دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

(هەرکەسێک بە براکەی بڵێ "ئەی کافر" ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە)، لە لەفزێکی تردا: (هەر کەسێکی موسڵمان موسڵمانێک تەکفیربکات، گەر کافربێت ئەوا

هیچ، ئەگینا خۆی کافرە)، لە لەفزێکی تردا: (گەر موسڵمانێک بە هاوڕێیەکەی بڵێ "ئەی کافر" ئەوا کوفرەکە دەچێتە سەر یەکێکیان).

{متفق عليه} البخاري : ژ 6104 ، مسلم : ژ 128

{رواه أبو داود في سننه - بسند صحيح} ژ 4687

{رواه الإمام أحمد في مسنده - بسند صحيح} ژ 5842

**2. لە "أبي ذر"ەوە (ﷺ) گوێ بیستی پێغەمبەر (ﷺ) بووە دەیفەرموو:**

(کەسێک کەسێکی تر بە فاسق دانانێت و بە کافر دانانێت، ئیللا بۆخۆی دەگەڕێتەوە، گەر هاوڕێکەی فاسق و کافر نەبێت)، لە لەفزی مسلم دا هاتووە: (هەرکەسێک کەسێک بانگ بکات بە کافر یان بە دوژمنی اللّٰه وە ئاواش نەبێت، ئەوا بۆخۆی دەگەڕێتەوە). {متفق عليه} البخاري : ژ 6045 ، مسلم : ژ 129

**3. لە "أبي هريرة"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(گەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ (ئەی کافر) ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە). {صحيح البخاري : ژ 6103}

**4. لە "أبي سعيد الخدري"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(هیچ کەسێک کەسێکی تر تەکفیر ناکات ئیللا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە، گەر کافر بێت ئەوا هیچ، ئەگینا خۆی کافر دەبێت بەهۆی تەکفیرکردنەکەی).

{رواه ابن حبان في صحيحه : ژ 248} پلەی فەرموودەکە : صحيح لغيره

**5. لە "معاوية بن سويد"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ (ئەی کافر) ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە). {رواه أبو القاسم البغوي في معجم الصحابة - بسند صحيح} ژ 2211

(وەرگێڕ: "معاوية بن سويد" تابعيە صەحابە نیە، واتا نەگەیشتووە بە پێغەمبەر (ﷺ)، نازانم چۆن سەنەدەکە بۆتە صحیح !؟ گەر مەبەستیان ئەوە بێت سەنەدەکە لە أبو القاسم البغوي وە تا دەگاتە معاوية بن سويد صەحیحە بەمەش دەبێتە "مرسل صحیح". هەرچەندە هەموو فەرموودەکانی پێشوو شایەتن بۆ صەحیحی دەقی ئەم فەرموودەیە و گومان لە صەحیح بوونیدا نیە بەڵام مەبەستمان خودی ئەم سەنەدەیە، واللّٰه أعلم).

**6. لە "حذيفة بن اليمان"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئەوەی زۆر لێی دەترسم لەسەرتان ئەوەیە پیاوێک قورئان دەخوێنێتەوە تاوەکو ڕووناکایی قورئان بە ڕوویەوە دیار دەبێت، وە سەرخەر و پشتیوانی ئیسلامە، جا

ماناكانی قورئانی گۆڕی تا ئەوەندەی الله بیەوێ، جا لە ئیسلام هاتە دەرەوە و فرێیدایە پشتی خۆیەوە، وە بەرەو دراوسێیەکەی ڕۆیشت بە شمشێرەوە و شیرکی دایە پاڵی، حذیفة دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری الله کامەیان لە پێشترن بۆ شیرك، ئەوەی شیرکەکەی درایە پاڵ یان ئەوەی شیرکی دایە پاڵی ؟ فەرمووی: ئەوەی شیرکی دایە پاڵی). {رواه ابن حبان في صحيحه - بسند جيد} ژ 81

**7. لە "عبد الله بن مسعود"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ:**

ئەگەر کەسێک بە کەسێکی ووت: تۆ دوژمنی منی، ئەوا یەکێکیان کافر بووە بە ئیسلام.

{رواه الخلال في السنة - بسند صحيح} ب 5/ لا 16/ ژ 1489

(وەرگێڕ: مەبەستی ئەوەیە نابێت کەسی موسڵمان بە دوژمنی خۆت بزانی)

**8. لە "يزيد الرقاشي"ەوە کە بە "أنس" (رضي الله عنه) ووتوە:**

ئەی باوکی حەمزە کەسانێک حوکمی کوفر و شیرکمان بەسەردا دەدەن، أنس ووتی: ئەمانە خراپترین بوونەوەرن.

{رواه أبو يعلى الموصلي في مسنده - بسند جيد} ب 7/ لا 136/ ژ 4099

**وە لەم بارەیەوە چەند فەرموودە و ئەثەرێکی زەعیف ڕیوایەت کراوە:**

**1. لە "معاذ بن جبل"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

(ئەوەی زۆر لێی دەترسم لەسەرتانە ئەوەیە پیاوێک الله شارەزای کردووە لە قورئان، تاوەکو ئیسلامی ناسی و ڕووناکایی لەسەر ڕووی بە دەرکەوت، جا شمشێرەکەی دەرهێنا و لە دراوسێیەکەی دا و کوفری دایە پاڵی، ووتیان: ئەی پێغەمبەری الله کامەیان لە پێشترن بۆ کوفر ئەوەی کوفری دایە پاڵی یان ئەوەی کوفری درایە پاڵ ؟ فەرمووی: ئەوەی کوفری دایە پاڵی). {رواه الفسوي في المعرفة والتاريخ - بسند ضعيف} 358/2

**2. لە "أبي هريرة"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

(دوو کەس لە بەهەشتدا کۆ نابنەوە کە یەکێکیان بە براکەی ووتبێ: ئەی کافر).

{رواه إسحاق بن راهويه في مسنده - بسند ضعيف جدا} ب 1/ لا 434/ ژ 502

**3. لە "ابن عمر"ەوە (رضي الله عنهما) دەڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:**

(دەست هەڵگرن لەسەر ئەهلی لا إله إلا الله، تەکفیریان مەکەن بەهۆی گوناهەوە، هەرکەسێک ئەهلی لا إله إلا الله تەکفیر بکات ئەوا خۆی نزیکترە لە کوفر).

{رواه الطبراني في المعجم الكبير - بسند ضعيف جدا} ب 12/ لا 272/ ژ 13089

**4. له "أنس بن مالك"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(گەر الله ئەهلی ئاسمانەکان و ئەهلی زەوییەکەی سزا بدات بەهۆی ڕشتنی خوێنی کەسێکی موسڵمان ئەوا سزایان دەدات بەبێ ئەوەی الله زوڵمی لێکردبن، وە ئەگەر کەسێک بگات بە الله خوێنی ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی ڕشتبێ هێشتا هیوای باشترە لەوەی بە برا موسڵمانەکەی ووتبێ: ئەی کافر). {حدیث منكر} (واتا ضعیف)

{رواه قوام السنة الأصبهاني في الحجة في بيان المحجة : ب 2/ لا 454/ ژ 440}

**5. له "عبد الله بن مسعود"ەوە (ﷺ) دەڵێ:**

هیچ دوو موسڵمانێک نیە ئیللا لەنێوانیاندا ستر هەیە لایەن الله عز وجل، جا گەر یەکێکیان ووشەیەک بە هاوڕێکەی بڵێ کە نێوانیان دابڕێ ئەوا ستری الله ی دڕاندووە، وە ئەگەر یەکێکیان بەوی تر بڵێ: (تۆ کافری) ئەوا یەکێکیان کافربووە.

{رواه البخاري في الأدب المفرد - بسند ضعيف} لا 155/ ژ 435

**وە پرسیار لە الإمام مالك بن أنس (رحمه الله) کرا دەربارەی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) :** (هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ کافر، ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە)، ووتی: ئەمە دەبینم لە حەڕوریەکان، پێی ووترا: ئایا وادەبینی بەمە کافر بن ؟ ووتی: نازانم ئەمە چیە. {البيان والتحصيل : 341/18}

**ابن الملقن (رحمه الله) باسی ئەوەی کردووە:**

ئەم فەرموودەیە چەند مانایەک لە خۆ دەگرێت، لەوانە: مەبەستی خەواریجەکانە کە ئیمانداران تەکفیر دەکەن، مالك بن أنس وای ووتوە، لەوانەیە ئەم ووتەیەی لەوەوە هاتبێ کە تەکفیریان بکات. {الإعلام بفوائد عمدة الأحكام : 504/8}

**ابن ناصر الدين الدمشقي (رحمه الله) دەڵێ:**

جا دوای ئەم هەڕەشەیە هیچ هەڕەشەیەکی زیاتر هەیە !؟ وە لەوانەیە شەیطان ڕازاندنەوە بۆ ئەو کەسە بکات کە شوێنی ئارەزووی کەوتووە و کوفر و چوونە دەرەوە لە ئیسلامی داوەتە پاڵ براکەی، شەیطان وای بۆ دەڕازێنێتەوە کە ووتەکانی ئەو دەربارەی براکەی حەقە وە ئەوەی داویەتیە پاڵ براکەی حەقە، ئەمە لە چوارچێوەی بابەتی جەرح و تەعدیلە، نابێت تەنانەت لە شتێکی کەمیش لەمانە بێدەنگ بێت، ئەی ئەگەر شتەکە گەورە بوو !؟ ئای چەندە دوورە لە ڕاستیەوە ئەم شتە، بەڕاستی

بواری قسەکردن لەسەر کەسەکان نشێوی سەختی تێدایە، ئەوەی سەری دەکەوێت لە مەترسیدایە، وە ئارەزوویێک چاوەڕێی دەکات کە ڕزگاربوونی نیە لە گوناهـ و تاوان، جا ئەو کەسەی کە براکەی داوەتە پاڵ کوفر گەر لێکۆڵینەوە لەگەڵ نەفسی خۆیدا بکات کە هۆکار چی بوو ئەم شتەی هەڵگیرساند ؟ ئەوا بۆی دەردەکەوێت هۆکارەکە هەوا و ئارەزوو بووە کە خاوەنەکەی بە هیلاک بردووە. {الرد الوافر : لا 13}

**دەڵێین: ڕووکەشی ئەم فەرموودانە بەڵگەبوون لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە هەر موسڵمانێک تەکفیر بکات بە ناحەق، بەڵام تەنها ئەوە نەبێت کە خاوەنی تەئویلە لە تەکفیرکردنەکەیدا، هەروەک ڕوونکردنەوەی دێتە پێش لە بابەتی پێنجەمدا بە پشتیوانی الله تعالى، ژمارەیەک لە زانایانی لێکۆڵەر ئەم فەرموودانەیان وەکو خۆی وەرگرتووە وەکو: الإمام البخاري و شيخ الإسلام ابن تيمية، وە ابن العطار الشافعي گێڕاویەتیەوە لە زانایانی فەرموودەناس و لێکۆڵەری شافعی مەزهەب کە ئەوانیش ئەم فەرموودانە وەکو خۆی وەردەگرن.**

**الإمام البخاري (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

بەشی: ئەوەی برا موسڵمانەکەی تەکفیر بکات بەبێ تەئویل ئەوا خۆی کافر دەبێت.

{صحيح البخاري : 26/8}

**ابن المنير (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

بوخاری ئەم بڕگەیەی فەرموودەکەی (فقد باء به أحدهما – ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە) کردووە بە بەڵگە لەسەر کافربوونی یەکێکیان، هەر بۆیە لە سەرە بابەتدا پەیوەستی کردووە بە ووشەی (بەبێ تەئویل).

{المتواري على أبواب البخاري : لا 362}

**القسطلاني لە کتێبی (إرشاد الساري) و السندي لە کتێبی (حاشية السندي على صحيح البخاري) و الدماميني لە کتێبی (مصابيح الجامع)دا هەمان قسەی (ابن المنير) دەکەن.** {إرشاد الساري : 65/9} ، {حاشية السندي على صحيح البخاري : 32/4} ، {مصابيح الجامع : 339/9}

## ابن العطار الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک موسڵمانێک تەکفیر بکات بە ناحەق، یان پێی بڵێ (ئەی کافر) بەبێ ئەوەی پشت بە شتێک ببەستێ کە ڕووکەشەکەی کوفر بێت، ئایا بەمە کافر دەبێت ؟ ووتەی زانا (متأخر)ەکانی شافعی خیلافی تێدا هەیە بەسەر دوو شێوە:

**یەکەمیان:** ئەمەش ووتەی زۆرینەیانە: کافر نابێت بەڵکو گوناهبارە بەم شتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ ئەی کافر، گەر ڕاست بێت ئەوا کافرە، ئەگینا بۆخۆی دەگەڕێتەوە) جا پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕاشکاوی باسی کافربوونی نەکرد بەڵکو مانای فەرموودەکەی ئەوەیە: گوناهی ووتەکەی بۆخۆی دەگەڕێتەوە.

**دووەمیان:** ئەمەش ووتەی فەرموودەناسان و لێکۆڵەرەوانە: کافر دەبێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کوفرەکەی گەڕاندەوە بۆ خاوەنی ووتەکە گەر کەسی بەرامبەر هیچ کوفرێکی تێدا نەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی حوکمدان بە کافربوونی، خاوەنی کتێبی (التتمة) و خاوەنی کتێبی (البحر) ئەم ووتەیان هەڵبژاردووە، والله أعلم.

{الإعتقاد الخالص من الشك والإنتقاد : لا 278}

(وەرگێر: أبو سعد المتولي الشافعي خاوەنی کتێبی "التتمة"یە ، أبو المحاسن الروياني خاوەنی کتێبی "البحر"ە).

**وە هەندێک زانا مانای ئەم فەرموودەیان لێکداوەتەوە بە نەهی کردن و توندبوون بەرامبەر تەکفیری موسڵمانان، وە ئەثەرێکیش ڕیوایەت کراوە کە ئەم مانایە بەهێز دەکات، بەڵام سەنەدەکەی زەعیفە.**

### لە "طاوس"ەوە ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:

من لەلای (ابن عمر) بووم پیاوێک هاتە لای ووتی: ئەی باوکی عبد الرحمن کەسانێک هەن بە ئارەزووی خۆیان حوکمدان دەدەن و بەهۆی تاوانەوە خەڵکی دەکوژن و (الفيء)ش تەنها بۆ خۆیان دەبەن، ئایا ئەمانە کافرن ؟ ووتی: نەخێر، پیاوەکە ووتی: کەسانێک حوکمدان لەسەر دەدەن بە کوفر و خوێنمان دەڕێژن بۆ نزیکبوونەوە لە الله ئایا ئەمانە کافرن ؟ ووتی: نەخێر، پیاوەکە ووتی: ئەی کوفر چیە ؟ ووتی: لەگەڵ الله پەرستراوێکی تر دابنێی بیکەیت بە دوو پەرستراو.

{رواه حرب الكرماني في مسائل الإمام أحمد - بسند ضعيف} 1075/3

***

## **دووەم: بەڵگە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکات.**

**ئەو کەسەی کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکات ئەم فەرموودانەی پێشوو بەڵگە بوون لەسەر کافربوونی بە قیاسێکی نزیک، وە چەند ئایەتێکی دەخرێتە پاڵ کە ئەو کەسەی تەکفیرکردووە کە ئایەتەکانی اللە بە درۆ دەخاتەوە یان ئینکاری لێ دەکات، هەروەک اللە تعالی فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا الْكَافِرُونَ ﴾ [العنكبوت : 47]، وە چەندان ئایەتی تر جگە لەمە، جا هەرکەسێک ئوممەت بە گشتی تەکفیر بکات ئەوا بە درۆ خەرەوەی ئەو شتانەیە کە لە قورئان و سوننەتدا هاتووە دەربارەی ئیثبات کردنی ئیسلام و ستایشی ئەم ئوممەتە، هەروەک اللە تعالی فەرموویەتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ﴾ [آل عمران : 110]، وە هەروەها اللە تعالی فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ [البقرة : 143].**

**وە بە درۆ خەرەوەی زۆرێک لە بەڵگەیە کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم ئوممەتە لەسەر گومڕایی کۆ نابێتەوە، یەکێک لەم بەڵگانە ئەوەیە کە ئوممەت قبوڵیان کردووە (واتا لەلایان صەحیحە) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (إن الله لا يجمع أمتي على ضلالة) واتا: (اللە ئوممەتەکەم کۆ ناکاتەوە لەسەر گومڕایی)، **وە هەروەها بەڵگەیەکی تر ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (لا يزال ناس من أمتي ظاهرين حتى يأتيهم أمر الله وهم ظاهرون) واتا: (بە بەردەوامی کەسانێک لە ئوممەتەکەم دیارن و سەردەکەون تاوەکو قیامەت دادێت ئەوان هەر دیار و سەرکەوتوون).

**{رواه الترمذي في سننه : ژ 2167} وقال: حديث غريب من هذا الوجه، وللحديث طرق وشواهد يتقوى بها.**

**(واتا سەنەدەکە زەعیفە بەڵام سەنەدی تر هەن کە بەهێزی دەکەن و دەیکەن بە حسن)**

**{متفق عليه} البخاري : ژ 3640 ، مسلم : ژ 4989**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەڵێ:**

ئوممەت لەسەر گومڕایی کۆ نابێتەوە، وە هەموویان هەڵناگەڕێنەوە، بەڵکو بێگومان اللە کەسانێک لە ئیمانداران دەهێڵێتەوە کە دیار و سەرکەوتوون تاوەکو هاتنی قیامەت. **{مجموع الفتاوى : 303/18}**

**هەر یەکە لە "البهوتي و الرحيباني" (رَحِمَهُمَاٱللَّهُ) باسی ئیجماعیان کردووە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئوممەتە لەسەر گومڕایی کۆ نابێتەوە، وە هەریەکە لە "القاضي عياض و النووي" (رَحِمَهُمَاٱللَّهُ) باسی ئیجماعیان کردووە دەربارەی کافربوونی ئەو کەسەی کە قسەیەک دەکات قسەکەی دەگات بەوەی کە هەموو ئوممەت گومڕا بکات.** {بڕوانە كشاف القناع : 170/6} ، {بڕواب مطالب أولي النهى : 281/6}

**شێخی نوێکەرەوەی دین محمد بن عبد الوهاب (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەڵێ:**

تەکفیرکردنی هەموو خەڵکی سەر زەوی، ئێمە لەلای الله بەرین لەم شتە، بەڵکو بڕوامان وایە ئوممەتی محمد (ﷺ) کۆ نابێتەوە لەسەر گومڕایی، بەڵکو الله ئەم ئوممەتەی پاراستووە لەوەی لەسەر گومڕایی کۆ ببێتەوە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی محمد (ﷺ). {الدرر السنية : 129/13}

**أبو الحسن الآمدي (رَحِمَهُٱللَّهُ) دەڵێ:**

ئایەت و فەرموودەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئوممەتی محمد هاوڕا نابن لەسەر هەڵە، وە ئەگەر ئوممەت هەڵبگەڕێتەوە ئەوا ڕاست دەبێت کە بووترێ: (ئوممەتی محمد هاوڕابوونە لەسە هەڵگەڕانەوە)، وە هەڵگەڕانەوەش هەڵەیە، ئەمەش ڕوودانی مەحاڵە. {الإحكام في فصول الأحكام : 280/1}

***

## سێیەم: بەڵگە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە ئەهلی سوننە و جەماعەت یان عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکات.

**بەڵگەکان لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە ئەهلی سوننە و جەماعەت یان عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکات خودی ئەو بەڵگانەن کە بەڵگە بوون لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە ئوممەت بە گشتی تەکفیر دەکات، وە چەند ووتەیەکی دەخرێتە سەر کە بەڵگەن لەسەر فەزڵی ئەهلی سوننە و جەماعەت، چونکە ئەوان کۆمەڵی ڕزگاربوون و تایبەتمەندی ئوممەتن و زۆرینەی ئوممەتن، جا تەکفیرکردنی ئەهلی سوننە و جەماعەت تەکفیرکردنی هەموو کۆمەڵەکانی تری لێدەکەوێتەوە کە پلەیان نزمترە لە ئەهلی سوننە و جەماعەت لە ئوممەتدا، وە عەوامی موسڵمانان زۆرینەی ئوممەتن، وە زۆرینەیان ئەهلی سوننە و جەماعەتن.**

**له "عبد الله بن عمرو"ەوە (ﭭ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئوممەتەکەم دابەش دەبێتە سەر حەفتا و سێ کۆمەڵە، هەموویان لە ئاگردان تەنها یەک دانەیان نەبێت، ووتیان: ئەم دانەیە کامەیە ئەی پێغەمبەری الله ؟ فەرمووی: ئەوەی من و هاوەڵانی لەسەرە).

{رواه الترمذي في سننه : ژ 2641} وقال: هذا حديث مفسر غريب لا نعرفه مثل هذا إلا من هذا الوجه، شيخ الإسلام ابن تيمية (ﬗ) له مجموع الفتاوى (345/3) دەڵێ: فەرموودەیەکی صەحیحە، مەشهورە لە سونەن و مەسانیدەکاندا.

(وەرگێڕ: دەستەواژەی "غريب" گەر بە تەنها هات لەلای "الترمذي" مانای زەعیف دەدات).

**له "أنس بن مالك"ەوە (ﭬ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(بەنی ئیسرائیل دابەش بوو بەسەر حەفتا و یەک کۆمەڵە، وە ئوممەتی منیش دابەش دەبێتە سەر حەفتا و دوو کۆمەڵە، هەموویان لە ئاگردان تەنها یەک دانەیان نەبێت، ئەوانیش جەماعەن). {رواه ابن ماجه في سننه : ژ 3993} ، البوصيري له مصباح الزجاجة (ب 4/ لا 180/ ژ 4041) دەڵێ: ئەمە سەنەدێکی صەحیحە، ڕاوییەکانی جێگای متمانەن.

**له "أبي أمامة"ەوە (ﭬ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئەم ئوممەتە جیادەبێتەوە بۆ سەر حەفتا و سێ کۆمەڵە، حەفتا و دوو کۆمەڵەیان لە ئاگردان، وە یەک دانەیان لە بەهەشت دایە، ووتمان: بۆمانی وەصف بکە، فەرمووی: زۆرینەن). {رواه الطبراني في المعجم الكبير : ب 8/ لا 273/ ژ 8051} ، وه الهيثمي له مجمع الزوائد ومنبع الفوائد (ب 6/ لا 234/ ژ 10436} دەڵێ: الطبراني ڕیوایەتی کردووە، ڕاوییەکانی جێگای متمانەن.

**شێخی ئیسلام ابن تيمية (ﬗ) دەڵێ:**

هەر بۆیە (پێغەمبەر ﷺ) کۆمەڵی ڕزگاربووی بەوە وەصف کرد کە ئەهلی سوننە و جەماعەتە، وە ئەوان زۆرینەن. {مجموع الفتاوى : 345/3}

**الملا علي القاري (ﬗ) دەڵێ:**

هەرکەسێک بڕوای وابێت هاوەڵان و ئەهلی سوننە کافرن، ئەوا کافرە بە ئیجماع.

{شم العوارض في ذم الروافض : لا 19} بە دەستکارییەکی کەم

**ابن الوزير الصنعاني (ﬗ) دەربارەی ئەو کەسەی کە عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکات دەڵێ:** تەکفیرکردنی عەوامی موسڵمانان کافربوونیان بەهێزتر دەکات،

چونکە حوکمدان بەسەریان بە ئیسلامەتی شتێکی زەرورەتی زانراوە لە دیندا، وە تەکفیرکردنیان ئینکاری کردنی ئەم زەرورەتە زانراوەیە.

{إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 392}

***

## چوارەم: بەڵگە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە چەند کەسێکی دیاریکراو لە موسڵمان تەکفیر دەکات.

**زانایان باسی کافربوونی ئەو کەسەیان کردووە کە تەکفیری پێغەمبەرێک لە پێغەمبەران یان فریشتەیەک لە فریشتەکان دەکات (عليهم السلام)، وە ئەو کەسەی تەکفیری هاوەڵان دەکات (رضي الله عنهم)، وە ئەو کەسەی تەکفیری ئەو زانایانەی ئوممەت دەکات کە ئیجماع دامەزراوە لەسەر موسڵمان بوونیان وەکو: سعيد بن المسيب و عمر بن عبد العزيز و مالك و الشافعي و أحمد و جگە لەمانەش (رحمهم الله).**

**وە تەکفیرکردنی پێغەمبەرێک کە ئیجماع هەبێت لەسەر پێغەمبەرایەتی بوونی، یان یەکێک لە فریشتەکان، ئەوا تانە دانە لە دین و کافربوونە بە پەیامی الله، سەرەڕای ئەمانەش بە درۆ خستنەوەیەکی ئاشکرایە بۆ دەقەکانی قورئان و سوننەت، کە تیایاندا ستایشی پێغەمبەران و فریشتەکان هاتووە (عليهم السلام)، سەرەڕای ئەمانەش ئیجماعی صەحیح هەیە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی جنێو بە پێغەمبەرێک بدات ئەی چۆن دەبێت گەر کوفر بداتە پاڵیان !؟ وە الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ ﴾ [البقرة : 98]،** (واتا: هەرکەسێک دوژمنی الله و فریشتەکانی و پێغەمبەرەکانی و جبریل و میکائیل بێت، ئەوا بەڕاستی الله دوژمنی کافرانە).

**وە لە بابەتی پێشوودا تێپەڕی ئەو ئیجماعەی کە ابن حزم گێڕایەوە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە یەکێک لە پێغەمبەران (عليهم السلام) تەکفیر دەکات.**

**وە تەکفیرکردنی هاوەڵان بە درۆ خستنەوەیەکی ڕوون و ڕاشکاوە بۆ ئەو دەقانەی قورئان و سوننە کە تیایاندا باسی فەزڵ و ستایشیان هاتووە، هەروەک الله تعالى فەرموویەتی: ﴿ وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ**

رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ [التوبة : 100]، ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ [الأنفال : 74]، ﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ [الحشر : 8]، ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ﴾ [الفتح : 18]، ﴿لَّقَد تَّابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ﴾ [التوبة : 117]، وه چەندان ئایەتی تر جگە لەمانە.
وە ژمارەیەک لە زانایان ئیجماعیان نەقڵ کردووە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە هاوەڵان تەکفیر دەکات، هەروەک لە پێشوودا باسکرا.

وە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی ئەو زانایانەی ئوممەت تەکفیر دەکات کە ئیجماع دامەزراوە لەسەر فەزڵیان، ئەوا ئەو کەسە موخالیفی ئیجماعی ئوممەتە لەسەر موسڵمان بوونی ئەم زانایانە، وە لە پێشوودا باسی تەکفیرکردنی ئەو کەسەمان کرد کە ئیجماعێک ڕەتدەکاتەوە کە دەقی لەسەر نیە، وە باسمان کرد کە زانایان دوو ڕەئیان هەیە دەربارەی ئەم تەکفیرکردنە.

***

## پێنجەم: بەڵگە لەسەر کافربوونی ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بەهۆی عەقیدە صەحیحەکەیەوە.

ئەم ووتەیەی الله تعالى: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ [المائدة : 5]، بەڵگەیە لەسەر کافربوونی کەسێک کە ئەمە حاڵی بێت.
(واتا: هەرکەسێک کافر بێت بە ئیمان ئەوا کردەوەکانی هەڵدەوەشێنەوە، وە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەم کەسە لە خەسارەتمەندانە).
جا هەر کەسێک موسڵمانێک تەکفیر بکات بەهۆی ئەو حەقەی کە موسڵمانەکە لەسەریەتی، ئەوا ئەو کەسە کافرە بەهۆی ئینکاریکردنی ئەو حەقەی کە کەسی بەرامبەری لەسەربوو، جا ئایەتەکە بە گشتی دەیگرێتەوە.

***

# بەشی سێیەم

## هۆکاری کافربوونی ئەو کەسەی کە موسڵمانێکی تەکفیرکردووە بە ناحەق

زانایان ژمارەیەک هۆکاریان باسکردووە دەربارەی کافربوونی ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق، هەیە بەهۆی ناشرین سەیرکردنی ئیسلامە، هەیە بەهۆی بە درۆ خستنەوەی بەڵگە شەرعیەکان و ڕەتکردنەوەی زەروڕەتێکی زانراوە لە دیندا، وە هەندێک زانا ڕووکەشی ئەو فەرموودانەیان وەرگرتووە کە حوکم دەدەن بە کافربوونی ئەوکەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق، بەبێ گوێ دانە بیروباوەڕی کەسی تەکفیرکەر هەروەک چۆن گوێ نادرێتە بیروباوەڕی کەسی سوجدە بەر بۆ بت.

لەمەی خوارەوەدا باسی ووتەی ئەو زانایانە دەکەین کە هۆکاری کافربوونی ئەو کەسەی موسڵمانێک تەکفیر دەکات گەڕاندوویانەتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە ئیمانی بە کوفر داناوە ئەمەش وەکو ئەوە وایە ئیسلام بە ناشرین سەیر بکەی:

**أبو جعفر الطحاوي** (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک بە هاوڕێکەی بڵێ (ئەی کافر) مانای وایە هاوڕێکەی کافرە چونکە ئەوەی هاوڕێکەی لەسەریەتی کوفرە، جا ئەگەر ئەوەی هاوڕێکەی لەسەری بوو کوفر نەبوو بەڵکو ئیمان بوو، ئەوا ئەوەی تەکفیری کرد ئیمانی بە کوفر داناوە، بەمەش کافر دەبێت بە الله تعالى، چونکە هەرکەسێک کافر بێت بە ئیمان ئەوا کافر بووە بە الله.

{شرح مشكل الآثار : 325/2}

**الخطابي** (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

ووتەکەی وا لێکدەدرێتەوە کە ئەو موسڵمانێکی بە کافر زانیوە، وە وادەزانێت دینی ئیسلام کە حەقە دینێکی باطلە، جا ئەمە کوفری خاوەنی ووتەکەی لێدەکەوێتەوە، بەو مەرجەی ئەو کەسەی کە پێی وترا کافر هیچ شتێکی کوفری تێدا نەدۆزرێتەوە.

{أعلام الحديث : 1/177}

**المتولي الشافعي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

گەر موسڵمانێک بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل، ئەوا کافر دەبێت چونکە ناوی لە ئیسلام ناوە کوفر. {روضة الطالبين : 10/65}

**ابن المنير** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

لەبەر ئەوەی گەر کەسی تەکفیرکەر قسەکەی ڕاست بێت ئەوا ئەوەی کوفری دراوەتە پاڵ کافرە، وە ئەگەر قسەکەی درۆ بێت ئەوا کەسی تەکفیرکەر ئیمانی بە کوفر داناوە، وە هەرکەسێک ئیمان بە کوفر دابنێت ئەوا کافر دەبێت.

{المتواري على أبواب البخاري : لا 362}

**الرافعي لە کتێبی "الشرح الكبير"دا دەڵێ:**

گەر بە موسڵمانێک بڵێ (ئەی کافر) بەبێ تەئویل، ئەوا کافر دەبێت چونکە ناوی لە ئیسلام ناوە کوفر. {العزيز في شرح الوجيز : 11/98}

**ئەو زانایانەی کە هۆکاری کافربوونی کەسی تەکفیرکەریان گەڕاندۆتەوە بۆ ئینکاری کردن وەکو: پوچەڵ کردنەوەی شەریعەت یان بە درۆ خستنەوەی دەقەکان یان ڕەتکردنەوەی شتێکی زانراو بە زەڕوڕەت لە دیندا، ئەمەش ووتەکانیانە:**

**القاضي عياض** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **باسی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسە دەکات کە هەموو هاوەڵان و هەموو ئوممەت تەکفیر دەکات دەڵێ:** چونکە ئەوان هەموو شەریعەتیان پوچەڵ کردۆتەوە، نەقڵی شەریعەت و نەقڵی قورئان دەپچڕێ، چونکە نەقڵ کەرەکان کافران بەگوێرەی قسەی ئەوان.

{الشفا بتعريف حقوق المصطفى : 611/2}

**ابن الوزير الصنعاني** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **باسی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسە دەکات کە تەکفیری عەوامی موسڵمانان دەکات دەڵێ:** چونکە حوکمدان بە موسڵمان بوونی ئەوان شتێکی زانراوە بە زەڕوڕەت لە دیندا، وە تەکفیرکردنیان ئینکارکردنی ئەم زەڕوڕەتە زانراوەیە. {إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 392}

**المظهري** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

چونکە موسڵمان بە گوناهکردن نابێتە کافر، وە هەرکەسێک بڕوای وابێت موسڵمان بە گوناهێک کافر دەبێت ئەوا بڕوای وایە کە حەڵاڵێک حەڕام دەکات، وە هەرکەسێک حەڵاڵێک حەڕام بکات ئەوا کافر دەبێت. {المفاتيح في شرح المصابيح : 172/5}

**شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **بەم ووتەیەی باسی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسە دەکات کە هاوەڵان تەکفیر دەکات:** ئەو بە درۆ خەرەوەی ئەم ئایەتانەیە کە قورئان لە چەند شوێنێک باسیکردووە دەربارەی ڕەزامەندی الله و ستایشی الله بۆ هاوەڵان. {الصارم المسلول على شاتم الرسول : لا 586}

**الخرشي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **بەم ووتەیەی باسی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسە دەکات کە هەموو هاوەڵان تەکفیر دەکات:** چونکە ئەو ئینکاری شتێکی بە زەڕوڕەت زانراوی کردووە لە دیندا، وە بە درۆ خەرەوەی الله و پێغەمبەرەکەیەتی.

{شرح مختصر خليل : 74/8}

**البهوتي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **بەم ووتەیەی باسی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسە دەکات کە ئوممەت بە گومڕا دادەنێت یان هاوەڵان تەکفیر دەکات:** چونکە ئەو بە درۆ خەرەوەی ئەو ئیجماعەیە کە ئوممەت لەسەر گومڕایی کۆ نابێتەوە، وە بە درۆ خەرەوەی ئایەت و فەرموودەکانە. {كشاف القناع : 170/6}

**الرحيباني الحنبلي** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەربارەی هۆکاری کافربوونی ئەو کەسەی کە ئوممەت بە گومڕا دادەنێت یان هاوەڵان تەکفیر دەکات دەڵێ:** چونکە ئەو بە درۆ خەرەوەی ئەو ئیجماعەیە کە ئوممەت لەسەر گومڕایی کۆ نابێتەوە، یان هاوەڵان تەکفیر بکات بەبێ تەئویل ئەوا کافرە، چونکە بە درۆ خەرەوەی پێغەمبەرە لە ووتەکەیدا. {مطالب أولي النهى : 281/6}

**وە ئەو زانایەی کە ڕووکەشی دەقەکانی وەرگرتووە هۆکاری حوکمدان بە کافربوون لەسەر کەسی تەکفیرکەر تەنها پەیوەست دەکات بە تەکفیرکردنی موسڵمان، بەبێ گوێدانە بیروباوەڕی کەسی تەکفیرکەر:**

**تقي الدين السبكي** (رَحِمَهُ اللَّهُ) **دەڵێ:**

ئێمە حوکمی کوفری بەسەردا دەدەین بەگوێرەی هاوەڵ پێدانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەرچی کەسی تەکفیرکەر وەکو کەسی سوجدە بەربۆبت باوەڕی بە ئیسلام هەبێت، یان وەکو کەسێک کە قورئان فڕێ دەداتە ناو زبڵ و پیسی وە هاوشێوەکانی، جا باوەڕبوونی بە ئیسلام ڕزگاری ناکات لەوەی کە حوکمی کافربوونی بەسەردا بدرێت.

**{فتاوى السبكي : 570/2} بە دەستکارییەوە**

**ئەوەی دەردەکەوێت ئەمەیە کە هۆکاری کافربوونی ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە ناحەق دەگەڕێتەوە بۆ بە درۆ خستنەوە و ڕەتکردنەوەی دەقەکان، ڕێک بە هەمان ئەو شێوەیەی کە باسمان کرد لە پێشوودا دەربارەی هۆکاری کافربوونی کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی کافر.**

**بەڵام ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بەهۆی بە ناشرین دانانی ئەو ئیسلامەی کە ئەو لەسەریەتی ئەوا ئەو کەسە کافرە، جا ئەو شتەی کە ئەو بە ناشرینی دادەنێت گەر لە ئەصلی دین بێت ئەوا موشریکە، ڕێک وەکو ئەو کەسەی کە شیرکی گەورە بە شتێکی جوان دادەنێت پەنا بە الله تعالى، وە ئەگەر یەکێک لە حوکمە شەرعیە ئیجماع لەسەرەکان بە ناشرین دابنێت ئەوا کافرە بەهۆی ئینکارکردنی بۆ ئەم شتە شەرعیە، والله أعلم.**

***

# بابەتی چوارەم

## پلەی دەست هەڵگرتن لە تەکفیرکردنی موسڵمانان لە دیندا

**هەروەک چۆن تەکفیرکردن حوکمێکی شەرعیە بواری تێدانیە بۆ عەقڵ، وە چەند پلەیەکی هەیە بەگوێرەی جێگیربوونی بەڵگەی شەرعی لەسەر کوفرەکە و ئاشکرایی حاڵی کەسی توشبوو بە کوفرەکە، بە هەمان شێوە حوکمدان بە ئیسلامەتی موسڵمانان و دەست هەڵگرتن لە تەکفیرکردنیان بەبێ هەبوونی هیچ کوفرێک، حوکمێکی شەرعیە بواری تێدانیە بۆ عەقڵ، وە چەند پلەیەکی هەیە بەگوێرەی جێگیربوونی بەڵگەی شەرعی لەسەر ئیسلامەتی و ئاشکرایی حاڵی ئەو کەسەی کە هاتۆتە ناو ئیسلام.**

**هی واهەیە زانراوە بە زەرورەت لە دیندا، وە هی واهەیە بەهۆی ئیجماعێک دەزانرێ کە پاڵپشتکراوە بە ئیجتیهاد، وە هی واهەیە بە حوکمی شەرعی ئاشکرا و دیار دادەنرێ، وە هی واهەیە لەمە نزمترە.**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:**

ئیماندار و موسڵمان ئەو کەسەیە کە الله و پێغەمبەرەکەی بە ئیماندار و موسڵمانیان داناوە ..... ئەم بابەتانەش هەمووی جێگیربووە بە شەرع.

{منهاج السنة النبوية : 92/5} بە دەستکارییەوە

**وەهەر شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ اللهُ) دەڵێ:**

ئیمان و کوفر لەم جۆرە حوکمانەن کە بە وەحی جێگیربوونە، وە بە بەڵگەی شەرعی ئیماندار و کافر لەیەکتر جیا دەکرێنەوە، نەوەک تەنها بە بەڵگەی عەقڵی.

{مجموع الفتاوى : 328/3}

**وە لە هەندێک فەرموودەدا هاتووە کە یەکێک لە ئەصلەکانی دینی ئیسلام ئەوەیە دەست هەڵبگیرێت لە تەکفیرکردنی ئەهلی لا إله إلا الله، تەکفیریان نەکەی بە گوناهێک کە کوفر نەبێت، وە گومان لەوە دانیە گەر ئەم فەرموودانە صەحیح ئەوا بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەم شتە لە ئەصلی دینە بەهۆی زەرورەتی عەقڵ و فیطرەت دەزانرێ، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم شتە لە کۆڵەگەکانی دینە و لە حوکمە شەرعیە گرینگەکانە.**

**له "أنس بن مالك"ەوە (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(سێ شت هەنە لە ئەصلی دینن، دەست هەڵگرتن لەو کەسەی کە دەڵێ لا إله إلا الله تەکفیری ناکەین بە گوناهێک و لە ئیسلام دەری ناکەین بە کردەوەیەک، وە جیهاد بەردەوام و نەبڕاوەیە لەو ڕۆژەی الله منی ناردووە تاکو ئەو کاتەی کۆتایی ئوممەتەکەم شەڕ دەکات لەگەڵ دەججال نە زوڵمی زاڵم نە عەدلی عادل جیهاد بەتاڵ ناکاتەوە، وە ئیمان هەبوون بە هەموو قەدەرەکان). {رواه أبو داود في سننه : ژ 2532} ، {رواه أبو يعلى الموصلي في مسنده : ب 7/ لا 287/ ژ 4311 - 4312} لەفزەکە هی ڕیوایەتی "أبو يعلى" یە، وە لە سەنەدەکەیدا کەسی نەناسراوی تێدایە، بەڵام فەرموودەی تر هەن وەکو شایەت ئەم فەرموودەیە بەهێز دەکەن.

**أبو داود (ﷺ) بێدەنگ بووە لە حوکمدان لەسەر ئەم فەرموودەیە لە سونەنەکەیدا، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لەلای أبو داود ئەم فەرموودەیە بە شایەتەکانی تر بەهێز دەبێت، لە کتێبەکەیدا (رسالة إلى أهل مكة) وتوویەتی: ئەو فەرموودانەی کە هیچم نەووتوە دەربارەیان ئەوا لەلای من "صالح"ە، وە هەندێکیان لە هەندێکیان صەحیحترن.** {رسالة أبي داود لأهل مكة : لا 27}

**وە ئەم ووتەیەی الله تعالى: ﴿ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ﴾ [التوبة : 5]، شایەتە بۆ ئەم ووتەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی:**

(دەست هەڵگرن لەو کەسەی کە دەڵێ لا إله إلا الله).

**هەروەها ئەم فەرموودەیەی ابن عمر ﷺ لە (الصحيحين)دا شایەتە بۆی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** فەرمانم پێکراوە لە دژی خەڵکی بجەنگم تاکو شایەتی دەدەن بە لا إله إلا الله و محمد رسول الله، وە نوێژ ئەنجام دەدەن و زەکات دەدەن، جا گەر ئەم شتانەیان کرد ئەوا خوێن و ماڵیان لە من پارێزراو دەبێت، تەنها بە حەقی ئیسلام نەبێت، وە حیسابیشیان لەسەر الله یە.{متفق عليه}البخاري: ژ 25 ، مسلم: ژ 32

**وە ئەو ئەثەرەی کە لە "جابر بن عبد الله"ەوە (ﷺ) ڕیوایەت کراوە شایەتە بۆ ئەم فەرموودەیە**، پیاوێک لە جابری پرسی: ئێوەی هاوەڵان هیچ کەسێکتان لە ئەهلی قیبلە بە موشریك ناو دەبرد ؟ جابر ووتی: معاذ الله، وە ترسا لەمە، پیاوەکە ووتی: ئێوەی هاوەڵان هیچ یەکێک لە خۆتان بە کافر ناو دەبرد ؟ جابر ووتی: نەخێر.

{أخرجه القاسم بن سلام في الإيمان - بسند صحيح} لا 95/ ژ 30

**وە ئەم فەرموودانەش شایەتن بۆ فەرموودەکە کە تیایاندا تەکفیری ئەو کەسە هاتووە کە موسڵمانێک تەکفیر بکات بە ناحەق.**
**ئەم فەرموودەیە لە چەند ڕێگایەکەوە ڕیوایەت کراوە زۆرینەی زۆر زەعیفە، ئێمەش باسیان دەکەین بۆ ئاگاداربوونەوە لێیان:**

**1. لە "ابن عمر"ەوە (﵁) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئیسلام لەسەر چەند صیفەتێک بنیات نراوە: شایەتیدان بە لا إله إلا الله و محمد رسول الله، وە داننان بەوەی کە لەلای "الله"وە هاتووە، وە جیهاد بەردەوام نەبڕاوەیە لەو ڕۆژەی الله پێغەمبەرەکەی ناردووە تاوەکو دوا کۆمەڵی موسڵمانان دەجەنگن لە دژی دەججال نە زوڵمی زاڵم نە عەدلی عادل لە جیهاد کەم ناکاتەوە، وە ئەهلی لا إله إلا الله بە گوناهێک تەکفیر مەکەن و حوکمی شیرکیان بەسەردا مەدەن، وە قەدەر خێرەکەی و شەڕەکەی لە لایەن الله عز وجل ە).

**{رواه الهروي في فوائده : لا 29/ ژ 6} وهو حديث موضوع (واتا فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە)**

**2. لە "علي و جابر"ەوە (ﭭ) دەڵێن پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئیسلام لەسەر سێ شت بنیات نراوە: ئەهلی لا إله إلا الله تەکفیریان مەکەن بە گوناهێک و حوکمی شیرکیان بەسەردا مەدەن، وە زانینی ئەوەی کە قەدەری خێر و شەڕ لەلای الله یە، وە جیهاد بەردەوام و نەبڕاوەیە تاکو ڕۆژی قیامەت لەو کاتەی الله محمد (ﷺ) ناردووە تاکو دوا کۆمەڵ لە موسڵمانان نە زوڵمی زاڵم نە عەدلی عادل ئەمە هەڵناوەشێنێتەوە). **{رواه الطبراني في المعجم الأوسط : ب 5/ لا 95/ ژ 4775}**

**وفي إسناده كذاب (واتا سەنەدەکەی کەسێکی درۆزنی تێدایە)**

**3. لە "أبي الدرداء و أبي أمامة و واثلة بن الأسقع و أنس بن مالك"ەوە (ﭫ)**

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (ئوممەتەکەم دابەش دەبێتە سەر حەفتا و سێ کۆمەڵە، هەموویان لەسەر گومڕایین، تەنها زۆرینە ڕەشەکە نەبێت، ووتیان: ئەی پێغەمبەری الله کێ زۆرینە ڕەشەکەیە ؟ فەرمووی: ئەوەی لەسەر ئەم شتەیە کە من و هاوەڵانی لەسەرە، ئەوەی موجادەلە و دەمە دەمێ نەکات لە دینی الله دا، وە هیچ کەسێک لە ئەهلی تەوحید بە گوناهێک تەکفیر نەکات، پاشان فەرمووی: ئیسلام بە غەریبی سەری هەڵدا، وە دووبارە غەریب دەبێتەوە، جا موژدە بێت لە غەریبەکان، ووتیان: ئەی پێغەمبەری الله غەریبەکان کێن ؟ فەرمووی: ئەوانەن کە چاکەکارن

كاتێک خەڵکی خراپەکارن، وە دەمە دەمێ ناکەن لە دینی الله دا، وە هیچ کەسێک لە ئەهلی تەوحید بە گوناهێک تەکفیر ناکەن).

{رواه الطبراني في المعجم الكبير - بسند ضعيف جدا} ب 8/ لا 152/ ژ 7659

**4. لە "الحسن البصري"ەوە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(ئیسلام لەسەر سێ شت بنیات نراوە: جیهاد بەردەوام و نەبڕاوەیە لەو کاتەی الله پێغەمبەرەکەی ناردووە تاکو دواین کۆمەڵی موسڵمانان کە دەجەنگن لە دژی دەجال زوڵمی زاڵم هەڵیناوەشێنێتەوە، وە دەست هەڵگرتن لە ئەهلی لا إله إلا الله کە بە گوناهێک تەکفیریان بکەن، وە قەدەرەکان خێر و شەڕیان لەلای الله یە).

{رواه يحيى بن سلام في تفسيره - بسند ضعيف} مختصر تفسير لابن أبي زمنين : 236/4

**5. لە "شهر بن حوشب الأشعري"ەوە دەڵێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) گەر لە مەجلیسەکەیدا هەڵسابوایە و قسەکانی تەواوکردبوایە ئەوا عبد الله بن رواحة شوێنەکەی دەگرتەوە و دەستی هاوڕێیەکی یان دوو سێ هاوڕێی دەگرت و دەیووت: وەرن با ئیمانمان زیاد بکەین، وەرن با ساتێک ئیمانمان نوێ بکەینەوە، وەرن با باسی پەروەردگارمان بکەین بە گوێڕایەڵی کردنی بەڵکو ئەویش باسمان بکات بە ڕەحمەتەکەی، جا پێغەمبەر () فەرمووی: سێ شت هەنە لە ئەصلی ئیمانن: دەست هەڵگرتن لەو کەسەی کە دەڵێ لا إله إلا الله تەکفیری مەکە و دەری مەکە لە ئیسلام بەهۆی کردەوەیەک، وە جیهاد بەردەوام و نەبڕاوەیە لەو کاتەی الله منی ناردووە تاکو کۆتایی ئوممەتەکەم دەجەنگن لە دژی دەجال نە زوڵمی زاڵم نە عەدلی عادل بەتاڵی ناکاتەوە، وە ئیمان هەبوون بە هەموو قەدەرەکان.

{رواه ابن أبي زمنين في أصول السنة : لا 217/ ژ 142} وفي إسناده متهم

(واتا سەنەدەکە کەسێکی تۆمەتبار بە درۆی تێدایە، بەمەش فەرموودەکە دەبێتە متروك)

(وەرگێڕ: شهر بن حوشب الأشعري تابعیە لە هۆزی ئەشعەریە، ئەشعەری مەزهەب نیە)

**وە بە بەردەوامی پێشەوایانی ئەهلی سوننە و جەماعەت بە درێژایی سەردەمەکان لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتدا باسی دەست هەڵگرتن دەکەن لە تەکفیرکردنی کەسێک بەهۆی گوناهێک کە ئەو کەس دەڵێ لا إله إلا الله، وە لەمەی خوارەوەدا باسی هەندێک لە ووتەکانیان دەکەین:**

### زهير بن عباد الرؤاسي (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

هەموو ئەو شێخانەی کە پێیان گەیشتووم لە مالك بن أنس و سفيان بن عيينة و عيسى بن يونس و فضيل بن عياض و عبد الله بن المبارك و وكيع الجراح وە جگە لەوانەش، کەسیان تەکفیر نەکرد بەهۆی گوناهێک، وە حوکمیان نەدەدا بە بەهەشت بۆ کەسێک ئەگەرچی سەرپێچی الله شی نەکردبێت، وە حوکمیان نەدەدا بە دۆزەخ بۆ کەسێک ئەگەرچی گوناهە گەورەکانیشی ئەنجام دابێت، وە هەرکەسێک پێچەوانەوەی ئەمە بکات ئەوا لەلای ئەوان بیدعەچیە. {رواه ابن أبي زمنين في أصول السنة : لا 222}

### الإمام أحمد بن حنبل (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

دەست هەڵگرتن لە ئەهلی قیبلە، وە کەس لەوان تەکفیر مەکە بەهۆی گوناهێکەوە، وە لە ئیسلام دەری مەکە بەهۆی کردەوەیەکە، مەگەر لەمەدا فەرموودەیەک هەبێت جا ئەوسا فەرموودەکە دەگێردرێتەوە وەکو خۆی. {طبقات الحنابلة : 27/1}

### وەهەر الإمام أحمد بن حنبل (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

صیفەتی ئیماندار لە ئەهلی سوننە و جەماعەت ئەوەیە شایەتی بدات بە لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله، وە دان بنێت بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەران و نێردراوان پێی هاتوون، وە دڵی لەسەر ئەمە چەسپا بێت کە زمانی دەیڵێت، وە گومانی نەبێت لە ئیمانەکەی، وە هیچ کەس لە ئەهلی تەوحید تەکفیر نەکات بەهۆی گوناهێکەوە. {طبقات الحنابلة : 329/1}

### وە هەردوو ئیمام أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي (رَحِمَهُمَا اللَّهُ) دەڵێن:

ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بەهۆی گوناهەکانیانەوە، وە نهێنیەکانیان (باطن) دەگێڕینەوە بۆ لای الله عز وجل.

{شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة : ب 1/ لا 197/ ژ 321}

### الإمام الآجري (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:

ئەهلی سوننە و جەماعەت واینابینن شمشێر بەکاربهێنن بەرامبەر هیچ کەسێک، وایدەبینن نوێژ و جیهاد لەگەڵ دەسەڵاتداران ئەنجام دەدرێت بە تەواوی، وە هیچ کەسێک تەکفیر ناکەن بە گوناهێک، وە حوکمی شیرکی بەسەردا نادەن.

{كتاب الشريعة : 2551/5} (وەرگێڕ: بێگومان مەبەستی موسڵمانێکە کە هیچ کوفرێکی لێ نەبینراوە، ئەگەرچی گوناهبار و خراپەکاریش بێت، بۆ دەسەڵاتدارانیش بە هەمان شێوە).

**ابن شاهين** (رحمه الله) **دەڵێ:**

کەس لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەم بەهۆی گوناهێکەوە، وە حوکمی دۆزەخ بەسەر کەسیاندا نادەم ئیللا ئەو کەسەی کە قورئان و پێغەمبەر (ﷺ) حوکمی بەسەردا داوە.

{شرح مذاهب أهل السنة : لا 320}

**قوام السنة الأصبهاني** (رحمه الله) **دەڵێ:**

هەندێک زانا ووتویانە: ئەصلی ئیمان بریتیە لە شایەتی لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأن محمدا عبده ورسوله، وە داننان بەوەی کە پێغەمبەرەکان و نێردراوەکانی پێی هاتوون، وە چەسپانی دڵ لەسەر ئەو شتەی کە زمانی دەیڵێت، وە گومانی نەبێت لە ئیمانەکەی، وە ئەهلی تەوحید تەکفیر نەکات بەهۆی گوناهێکەوە.

{الحجة في بيان المحجة : 288/2}

**أبو الحسن الأشعري** (رحمه الله) **دەربارەی بەشێک لە عەقیدەی ئەهلی سوننە و جەماعەتدا دەڵێ:** هیچ کەسێک لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەن بەهۆی گوناهێکەوە کە ئەنجامی دەدات وەکو زینا و دزی و هاوشێوەی ئەمانە لە گوناهە گەورەکان. {مقالات إسلاميين : لا 293}

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة** (رحمه الله) **دەڵێ:**

هەر بۆیە زانایانی سەلەف لە پێشەکی کتێبە عەقیدەییەکاندا دەڵێن: هیچ کەسێک لە ئەهلی قیبلە تەکفیر ناکەین بە گوناهێک، وە لە ئیسلام دەری ناکەین بەهۆی کردەوەیەک. {مجموع الفتاوى : 671/7}

**وە لە کتێبی الله تعالى دا نەهیکردن هاتووە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی کە ئیسلام بە ڕووکەش (ظاهر) دەردەخات تەنانەت بە بچووکترین دروشم بێت لە دروشمەکانی ئیسلام تاوەکو حاڵی ڕوون دەبێتەوە، وە لە سوننەتی پاکدا فەرمانکراوە بە دەست هەڵگرتن لەو کەسەی کە ئیسلام بە ڕووکەش نیشان دەدات تەنانەت بە ووتەیەکی گومان هەڵگریش بێت.**

**الله تعالى فەرموویەتی:** ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلَا تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَىٰ إِلَيْكُمُ السَّلَامَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِندَ اللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوا إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ [النساء : 94]،

(واتا: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە گەر لە پێناوی الله چوون بۆ شوێنێک بۆ

جیهادکردن، لێی بکۆڵنەوە و خێرا دەست بە کوشتن مەکەن تاکو موسڵمان و کافر لەیەکتر جیا بکەنەوە، وە کەسێک کە سەلامتان لێ دەکات پێی مەڵێن ئیماندار نیت، ئایا دەستکەوتەکانی دونیاتان دەوێ لەلای الله دەستکەوتی زۆر هەیە بۆتان، بە هەمان شێوە ئێوەش ئیمانتان شاردبوویەوە جا الله تعالى منەتی بەسەردا کردن و دەسەڵاتتان گرتە دەست و ئیمانتان ئاشکرا کرد، جا لێی بکۆڵنەوە بەڕاستی الله بەوە ئاگادارە کە ئێوە ئەنجامی دەدەن).

**(وەرگێڕ: بە پێویستی دەزانین هەڵوەستەیەک لەسەر تەفسیری ئەم ئایەتە و هۆکاری دابەزینی بکەین، بەهۆی ئەو کێشمەکێشمەی کەوتۆتە نێوان موەحیدانەوە لەسەر تەکفیرکردن و نەکردنی کەسێک کە دروشمی ئیسلامی تێدا دەبینرێ لە دار الکفر الطارئ یاخود دەووترێ دار الردة، بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەدا لە "ابن عباس"ەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێک کۆمەڵێک مەڕو ماڵاتی هەبوو بەلای موسڵماناندا تێپەڕی، موسڵمانان دوای کەوتن پیاوەکە ووتی: السلام علیکم، موسڵمانانیش پیاوەکەیان کوشت و مەڕ و ماڵاتەکەیان برد ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی، لە ڕیوایەتێکی تری صەحیحی بوخاریدا هاتووە ئەو هاوەڵەی کە پیاوەکەی کوشت "المقداد"بوو، پێغەمبەر ﷺ بە میقدادی فەرمووی: گەر پیاوێک ئیمانەکەی شاردبێتەوە و لەگەڵ کافراندا بژی، جا ئیمانی دەرخست تۆش کوشتت، تۆش بە هەمان شێوە پێشتر لە مەککەدا ئیمانەکەت شاردبوویەوە، ابن تیمیة رحمه الله دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: الله تعالى فرمانی پێکردن بە لێکۆڵینەوە و سەلامدان لە کاتی جیهاد دا، وە بە کەسێکی مجهول الحال نەڵێن تۆ ئیماندار نیت لەبەر دەستکەوتی دونیایی، کە دەربارەی دەڵێن ئیماندار نیت هەواڵێکی بێ بەڵگەیە بەڵکو بۆ هەوا و ئارەزووی نەفسی خۆیانە بۆ ئەوەی ماڵەکەی ببەن، جا گەر ئەم کەسە لە "دار الحرب"یش دابێت گەر سەلامی کرد یان لەوانەیە ئیماندار بێت ئیمانەکەی شاردبێتەوە هەروەک چۆن ئێوە لە پێشتردا ئیمانداربوون ئیمانەکەتان شاردبوویەوە، جا ئەگەر موسڵمانێک سەلامی کرد و باسی ئەوەی کرد کە ئەو سەلامەتە بۆیان و شەڕکەر نیە، ئەوا لێی بکۆڵنەوە، مەیکوژن و ماڵەکەی مەبەن تاوەکو بۆتان دەردەکەوێ کە کەسەکە ڕاستگۆیە یان درۆزنە. بڕوانە کتێبی "الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح" بەرگی 6 - لا 455). (ئەمانەش هەموو بەڵگەی ڕوونن لەسەر قبوڵکردنی دروشمی ئیسلام لە کەسێک کە لە دار الکفری الأصلي یان الطارئ دا دەژی).**

**لە "ابن عباس"ەوە (رضي الله عنهما) دەگێڕێتەوە:**

پیاوێک لەناو مەڕ و ماڵاتەکەی دابوو جا موسڵمانان دوای کەوتن، پیاوەکە ووتی: السلام علیکم، جا موسڵمانان کوشتیان و مەڕو ماڵاتەکەیان برد، جا الله ئەم ئایەتەی

دەربارەی ئەم ڕووداوە دابەزاند تاکو دەگاتە (تبتغون عرض الحياة الدنيا) ئەمە واتای غەنیمەت. {متفق عليه} البخاري : ژ 4591 ، مسلم : ژ 7651

وە لە چەند سەنەدێکەوە ڕیوایەت کراوە کە کەسە کوژراوەکە (عامر بن الأضبط) بووە، وە بکوژەکەی (محلم بن جثامة) بووە، وە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ تاوەکو داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات جا لە بەردەمی دانیشت، پێی فەرموو: ناوت چیە ؟ ووتی: من "محلم بن جثامة"م، جا پێغەمبەر ﷺ دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: خوایە لە محلم بن جثامة خۆش مەبە، هەڵسەوە، جا هەڵسایەوە و فرمێسکەکانی بە عەباکەی دەسڕیەوە. {رواه الإمام أحمد في مسنده : ژ 23879} بسند حسن بالشواهد والمتابعات

(واتا بەهۆی چەند سەنەدێکی ترەوە ئەم سەنەدە لە زەعیفیەوە بۆتە حەسەن)

وە هەروەها ڕیوایەت کراوە کە دەڵێن: چەند ڕۆژێکی کەم دوای ئەم ڕووداوە پیاوە بکوژەکە مرد، ئیجا نێژرا و تەرمەکەی هاتەوە سەر زەوی، جا کەس و کارەکەی هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان باسکرد، فەرمووی: بینێژن، دیسان نێژرا و هاتەوە سەر زەوی، کەس و کارەکەی هەواڵیان بە پێغەمبەر (ﷺ) دا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: زەوی ڕەتی کردەوە قبوڵی بکات فڕێی بدەنە ئەشکەوتێک لە ئەشکەوتەکان، **لە ڕیوایەتێکی تردا فەرموویەتی:** زەوی لەو خراپتر قبوڵ دەکات، بەڵام الله ویستی فێرتان بکات کە خوێن چەندە گەورەیە.

{رواه عبد الرزاق في مصنفه - بسند مرسل صحيح} ب 10/ لا 173/ ژ 18720

{رواه الطبراني في المعجم الكبير - بسند ضعيف} ب 18/ لا 226/ ژ 562

### لە "أسامة بن زيد"ەوە (رضي الله عنهما) دەڵێ:

پێغەمبەر (ﷺ) ئێمەی نارد بۆ "حورەقە" کە هۆزێکە لە جوهەینە، جا کاتی بەیانی بوو هێرشمان کردە سەر قەومەکە و سەرکەوتین بەسەریاندا، ئوسامە دەڵێ: من و پیاوێکی ئەنصاری بە دوای پیاوێکی ئەوان کەوتین، کاتێک بەسەریدا زاڵ بووین ووتی: لا إله إلا الله، جا پیاوە ئەنصارییەکە دەستی هەڵگرت لەسەری، منیش ڕمحەکەم لێیدا تاکو کوشتم، جا کاتێک گەڕاینەوە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت، پێی ووتم: ئەی ئوسامە کوشتت دوای ئەوەی ووتی لا إله إلا الله ؟ ووتم: ئەی پێغەمبەری الله ئەمەی ووت بۆ خۆپاراستن، فەرمووی: کوشتت دوای ئەوەی ووتی لا إله إلا الله ؟

جا به بەردەوامی دووبارەی دەکردەوە لەسەرم، تاکو خۆزگەم خواست پێش ئەمرۆژە موسڵمان نەبوومایە. {متفق عليه} البخاري : ژ 6872 ، مسلم : ژ 191

**لە "ابن عمر"ەوە (رضي الله عنهما) دەڵێ:**

پێغەمبەر (ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ "بني جذيمة" جا بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش نەیانتوانی بە جوانی بڵێن: أسلمنا (موسڵمان بووین) دەیانووت: صبأنا صبأنا، جا خالید دەستی بە کوشتن و بە دیل گرتن کرد، وە دیلی دایە هەر پیاوێک لە ئێمە، تاکو ڕۆژێک خالید فرمانی پێکردین هەریەک لە ئێمە دیلەکەی خۆی بکوژێت، منیش ووتم: والله دیلەکەی خۆم ناکوژم، وە هیچ یەکێک لە هاوەڵانم دیلەکەی خۆی ناکوژێت، تا گەیشتینە لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆمان باسکرد، جا پێغەمبەر (ﷺ) دەستی بەرزکردەوە و فەرمووی: خوایە من بەریم بۆلای تۆ لەو شتەی کە خالید ئەنجامیدا، خوایە من بەریم بۆلای تۆ لەو شتەی کە خالید ئەنجامیدا. {صحيح البخاري : ژ 4339}

**وە لە پێغەمبەر (ﷺ) بە صەحیحی هاتووە لە چەند لایەنێکەوە دەربارەی سەرزەنشتکردنی بۆ خەواریجەکان، چونکە ئەوان موسڵمانان تەکفیر دەکەن بەهۆی گوناهەکانەوە، وە خوێن و ماڵیان حەڵاڵ دەکەین بەهۆی ئەمەوە.**

**لە "أبي سعيد الخدري"ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی صیفەتی خەواریجەکان فەرموویەتی:** قورئان دەخوێنن لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات (واتا تەنها لەناو دەمیاندایە بە دڵیان ناگات)، لە دین دەردەچن وەکو دەرچوونی تیر لە کەوانەوە، موسڵمانان دەکوژن و واز لە بت پەرستان دەهێنن، گەر من پێیان بگەم دەیانکوژم وەکو کوشتنی قەومی عاد. {متفق عليه} البخاري : ژ 3344 ، مسلم : ژ 2415

**(وەرگێڕ: قەومی عاد بە سزایەکی زۆر بە ئێش لە ناوچوون کە بایەکی زۆر بەهێز بوو، ئەم جۆرە دەربڕینانە بۆ ئەوە بەکاردێت تا کەسی بەرامبەر تێبگات لە مەبەستی قسەکەر، واتا چۆن قەومی عاد کەسیان نەمایەوە، منیش کەسیان ناهێڵمەوە گەر پێیان بگەم).**

**لە "علي"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ بیستم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:**

قەومێک دەردەچێت لە کۆتایی دونیا، تەمەنیان بچووکە و مێشکیان پوچە، جوانترین ووتەیان هەیە و بانگەشەی بۆ دەکەن، ئیمانیان لە قوڕگیان تێپەڕ ناکات، لە دین

دەردەچن هەروەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، جا لە هەر شوێنێکدا پێیان گەیشتن بیانکوژن، ئەوەی بیانکوژێت پاداشتی کوشتنەکەی هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا.

{متفق عليه} البخاري : ژ 6930 ، مسلم : ژ 2427

**لە"بكير بن عبد الله الأشج"ەوە کە پرسیاری لە "نافع" کردووە:**

عبد الله ی کوڕی ئیمامی عمر (الحرورية) چۆن دەبینی ؟ نافع ووتی: بە خراپترین بوونەوەری الله ی دادەنان، دەیووت: ئەمانە ئایەتانێک بەکاردەهێنن دەربارەی کافران دابەزیون، ئەوان لەسەر ئیماندارانی دەسەپێنن.

{رواه ابن وهب في موطأ - بسند صحيح} ب 1/ لا 16/ ژ 66

{رواه البخاري في صحيحه معلقا : 16/9}

**وە ژمارەیەک فەرموودە ڕیوایەت کراوە دەربارەی نەهیکردن لە تەکفیرکردنی ئەهلی قیبلە، بەڵام زەعیفن ئێمەش باسیان دەکەین وەکو ئاگادارکردنەوە لێیان:**

**1. لە"أبي الدرداء"ەوە(ﷺ)دەڵێ گوێ بیستی پێغەمبەر(ﷺ)بووم دەیفەرموو:**

هیچ یەکێک لە ئەهلی قیبلەکەم تەکفیر مەکەن بە گوناهێک گەرچی گوناهە گەورەکانیش ئەنجام بدەن، وە نوێژ لەدوای هەموو ئیمامێکەوە بکەن و جیهاد لەگەڵ هەموو کاربەدەستێک بکەن.

{رواه الدارقطني في سننه - بسند ضعيف جدا} ب 2/ لا 401/ ژ 1760

**2. لە "واثلة بن الأسقع"ەوە (ﷺ) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

ئەهلی قیبلەکەتان تەکفیر مەکەن گەرچی گوناهە گەورەکانیش ئەنجام بدەن، وە نوێژ لەگەڵ هەموو ئیمامێک بکەن و جیهاد لەگەڵ هەموو کاربەدەستێک بکەن و نوێژ لەسەر هەموو مردوویێک بکەن.

{رواه الدارقطني في سننه - بسند ضعيف جدا} ب 2/ لا 403/ ژ 1766

**3. لە "عائشة"ەوە (ﷺ) دەڵێ گوێ بیستی پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو:**

هیچ یەکێک لە ئەهلی قیبلەکەتان تەکفیر مەکەن بەهۆی گوناهێکەوە گەرچی گوناهە گەورەکانیش ئەنجام بدەن، وە نوێژ لەگەڵ هەموو ئیمامێک بکەن و جیهاد لەگەڵ هەموو کاربەدەستێک بکەن.

{رواه الطبراني في المعجم الأوسط - بسند ضعيف جدا} ب 3/ لا 175/ ژ 2844

**4. له "مكحول"ەوە (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) لەکاتی ئەو نەخۆشیەی کە تیایدا مرد وتوویەتی:**

چوار شت هەیە لە پێغەمبەر (ﷺ) پێم نەووتون، ئێستا پێتانی دەڵێم: ئەهلی دینەکەتان تەکفیر مەکەن ئەگەرچی گوناهە گەورەکانیشیان ئەنجامدا، وە نوێژ لەسەر هەموو مردووێک بکەن، وە نوێژ لە دوای هەموو ئیمامێکەوە بکەن، وە جیهاد لەگەڵ هەموو کاربەدەستێک بکەن. {رواه حرب الكرماني في مسائله - بسند ضعيف} 1066/3

***

# بابەتی پێنجەم

## پلەی ئەو کەسانەی کە موسڵمانێکیان تەکفیرکردووە وە حوکمەکانیان

بزانە ڕەحمەتی خوات لێبێ ئەم بابەتە بنیات نراوە لەسەر ئەم دوو پێشەکیە:

**یەکەم:** دین چەند پلەیەکی هەیە وە پەیڕەوانی دینیش پلەیان جیایە تیایدا، لە سوننەتی پاکدا هاتووە کە هەندێک بەشی ئیمان باشترە لە هەندێک بەشی تری.

لە "أبي هريرة"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

ئیمان حەفتا و هەندێک بەشە یان شەست و هەندێک بەشە، جا باشترینی ووتنی لا إله إلا الله یە، وە نزمترینی لادانی نارەحەتیە لەسەرڕێگا، وە حەیاش بەشێکە لە ئیمان.

{متفق عليه} البخاري : ژ 9 ، مسلم : ژ 62 ، لەفزەکەش هی موسلیمە.

الله تعالى فەرموویەتی:﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ﴾ [فاطر : 32].

(وەرگێڕ: تەفسیری ئەم ئایەتە خیلافی زۆری تێدایە هەم لەنێوان زانایانی سەلەف هەم لەنێوان موفەسیرەکان، گەر بێتو هەمووی باس بکەین زۆر درێژە دەکێشێ، ناکرێ تەفسیرێکیش ئاماژە پێ بدەین و ئەوانی تر وازلێ بێنین، بۆیە تەفسیری ئایەتەکە نانوسین تەنها باسی ئەوە دەکەین کە بۆچی نوسەر ئەم ئایەتەی لەم شوێنەدا هێناوە ئەویش ئەوەیە باسەکە باسی پلە بەرزی و نزمی ئیمانە، ئایەتەکەش باسی کەسی "ظالم و مقتصد و سابق" دەکات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسانێک زۆر باشن و پلە بەرزن کەسانێک زۆر خراپن و پلە نزمن وە کەسانێک لە نێوانی ئەم دووانە دان ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەرزی و نزمی ئیمان و ئیمانداران، ئەگەرچی دەربارەی ئەم سێ ووشەیەش خیلاف هەیە بە تایبەتی ظالم، ئێمەش بەوەندە دەیبڕێنینەوە، والله أعلم).

ڕیوایەت کراوە لە "ابن عباس"ەوە (رضي الله عنه) کە ووتویەتی:

ئەم سێ چینە ئوممەتی محمدن (ﷺ) الله هەموو ئەو کتێبانەی پێداون کە دایبەزاندووە، جا زاڵمەکەیان لێی خۆش دەبێت، ناوەندەکەیان حیسابێکی سوکی لەگەڵدا دەکرێت، وە سابقەکەش دەچێتە بەهەشتەوە بەبێ حیساب.

{رواه الطبري في تفسيره : 465/20} لە ڕێگای علي بن أبي طلحة الوالبي

**دووەم: ئەو ڕێگایانەی کە حوکمی پێدەدرێت لەسەر موسڵمانێتی کەسێکی دیاریکراو جیاوازە لە ڕووی دەرکەوتن و ئاشکراییەوە، جاری واهەیە موسڵمانێتی کەسێکی دیاریکراو دەزانرێ بە زەرورەت لە دیندا وەکو موسڵمانێتی پێغەمبەران و هاوەڵان و ئوممەت بە گشتی و ئەهلی سوننە و جەماعەت بە گشتی، وە جاری واهەیە بە ئیجماعێک دەزانرێ کە هیچ پاڵپشتێکی نیە لە دەق شەرعی وەکو موسڵمانێتی زانا ناودارەکانی ئیسلام ئەوانەی کە ئیجماع دامەزراوە لەسەر فەزڵیان.**

**بەڵام هەر تاکێک لە موسڵمانان حوکمی موسڵمان بوونیان دەدرێت بەگوێرەی ڕووکەشیان (ظاهر)، ئەمەش بە هەمان شێوە جیاوازە، هەیە یەکدەنگی لەسەرە، هەیە خیلافی لەسەرە.**

**الكاساني** (رحمه الله) **دەڵێ:**

ئەو ڕێگایانەی کە حوکمی لەسەر دەدرێت بە موسڵمانێتی کەسێک، سێ ڕێگان: نص و دلالة و تبعية (دەق و ئاماژە و شوێنکەوتن).

**النص (دەق)** : ئەمەیە کە شایەتی یان هەردووک شایەتی بهێنێت، یان هەردووک شایەتی بهێنێت لەگەڵ خۆ بەریکردن بەڕاشکاوی لەو شتەی کە لەسەری بووە.

**الدلالة (ئاماژە)** : وەکو نوێژکردنی کەسێکی ئەهلی کیتاب، یان کەسێکی ئەهلی شیرك نوێژ بکات بە جەماعەت، حوکمی موسڵمانێتی دەدرێت لەلای ئێمە (واتا لای حەنەفیەکان)، وە لەلای الشافعي (رحمه الله) حوکمی موسڵمانێتی نادرێت، گەر بە تەنهاش نوێژ بکات حوکمی موسڵمانێتی نادرێت.

**التبعية (شوێنکەوتن)** : منداڵ حوکمی موسڵمانێتی دەدرێت بەگوێرەی دایک و باوکی جا منداڵەکە فام بکات یان نا **مادام دوای فام کردن خۆی موسڵمان نەبووە***، وە حوکمی موسڵمانێتی دەدرێت بەگوێرەی ئەو شوێنەی (ئەو دارەی) تیایدا دەژی.

**{البدائع الصنائع : 104/7} بە دەستکارییەوە**

***(وەرگێڕ: واتا گەر منداڵەکە کافربوو بەڵام دوای فام کردن موسڵمان بوو، ئەوا ئەوکات حوکمی موسڵمانێتیەکەی بەگوێرەی "التبعية" نابێت بەڵکو دەبێتە النص).**

**(وەرگێڕ: ئیمام شافعي نوێژ ناکاتە هۆکاری حوکمدان بە موسڵمانێتی بۆ ئەهلی کیتاب و موشریك نەوەک بۆ موسڵمانان، هەروەک لە ووتەکەدا بە ڕوونی دیارە).**

**بەگوێرەی ئەو ووتانەی تێپەڕین باسی پلەکانی ئەو کەسە دەکەین کە موسڵمانێکی تەکفیرکردووە بە ناحەق بەگوێرەی بەهێزی بەڵگەی موسڵمانێتی ئەو کەسەی کە تەکفیرکراوە:**

**پـــــلەی یەکەم: ئەو کەســــەی موســــڵمانێکی تەکفیرکـــــردووە کە موسڵمانێتیەکەی زانراوە بە زەرورەت لە دینی ئیسلامدا.**

**دەچێتە ناو ئەم پلەیەوە هەرکەسێک پێغەمبەرێک یان فریشتەیەک تەکفیر بکات، پاشان ئەو کەسەی کە هاوەڵان تەکفیر بکات، پاشان ئەو کەسەی ئوممەت تەکفیر بکات بە گشتی، پاشان ئەو کەسەی ئەهلی سوننە و جەماعەت تەکفیر بکات بە تایبەتی یان عەوامی موسڵمانان تەکفیر بکات.**

**ابن حزم** (رحمه الله) **دەڵێ:**

هەرکەسێک شیرك و كوفر بداتە پاڵ ئادەم (عليه السلام) ئەوا ئەم کارەی کوفرێکی تەواوە خیلافی تێدانیە لەلایەن هیچ کەسێکی ئوممەت. {الفصل في الملل والأهواء والنحل : 4/4}

**ابن الوزير الصنعاني** (رحمه الله) **دەڵێ:**

هەرکەسێک فریشتەیەک تەکفیر بکات ئەوا کافر بووە.

{إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 384}

**الملا علي القاري** (رحمه الله) **دەڵێ:**

هەرکەسێک بڕوای وابێت هاوەڵان و ئەهلی سوننە کافرن، ئەوا کافرە بە ئیجماع.

{شم العوارض في ذم الروافض : لا 19} بە دەستکارییەکی کەم

**ابن الوزير الصنعاني** (رحمه الله) **دەربارەی تەکفیری ئەو کەسەی عەوامی موسڵمانان تەکفیر دەکات دەڵێ:** تەکفیرکردنی عەوامی موسڵمانان کافربوونیان بەهێزتر دەکات، چونکە حوکمدان بەسەریان بە ئیسلامەتی شتێکی زەروڕەتی زانراوە لە دیندا، وە تەکفیرکردنیان ئینکاری کردنی ئەم زەروڕەتە زانراوەیە.

{إيثار الحق على الخلق في رد الخلافات : لا 392}

**حوکمی کەسی تەکفیرکەر لەم پلەیەدا کافربوونە بە ئیجماع، چونکە موسڵمانێتی ئەمانە لەلای کەسی تەکفیرکەر شتێکی زانراوە بە زەروڕەت لە دینی ئیسلامدا، جا تەکفیرکردنیان ئینکاری کردنی ئەم زەروڕەتە زانراوەیە.** ***

**پلەی دووەم: ئەو کەسەی تەکفیری پێشەوایانی موسڵمانان لە زانایان و ڕێزداران دەکات کە موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر دینداری و گەورەییان.**

**تقي الدين السبكي (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

هەریەکێک لە خەواریجەکان بسەلمێ لەسەری کە تەکفیری ئەوانە دە کەسە یان کەسانی تریش دەکات لەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێداون ئەوا کافرە، وە ئەمە پابەندم ناکات بەوەی کە بڵێم زانا ناودارەکانی ئوممەت ئەوانەی ئیجماع دامەزراوە لەسەر پێشەوایەتیان بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) موژدەی بەهەشتی پێنەداون هەرکەسێک ئەوانیش تەکفیر بکات کافرە، وەکو عمر بن عبد العزيز و الشافعي و مالك و هاوشێوەکانیان، ئەگەرچی دڵ بۆ ئەمە دەڕوات کە ئەمانەش بدەمە پاڵ ئەوان، گومانمان نیە لە ئیمانیان، هەرکەسێک تەکفیریان بکات کوفرەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە..... وە بە دووری نازانم بڵێم تانەدان لەمانە تانەدانە لە دین، مەبەستم الشافعي و مالك و هاوشێوەکانیان ج چای هاوەڵان (ﷺ)، ئەمانە بەهۆی ئیجماعی خەڵکی لەسەریان دەچنە پاڵ ئەوانەی کە فەرموودەکە دەربارەیان هاتووە، بەڵام باقی ئیماندارانی تر ئەوانەی کە حوکمی ئیمانیان لەسەر دراوە پابەند نیم بەوەی کە هەرکەسێک کوفر بداتە پاڵ یەکێک لەوان ئەوا تەکفیری بکەم، چونکە ئیمانی ناخی (باطن) یەکلانەبۆتەوە. {فتاوى السبكي : 571/2} بە دەستکارییەوە

(وەرگێڕ: مەبەستی لە فەرموودەکە ئەوەیە کە دەڵێ: هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ ئەی کافر ئەوا بۆخۆی دەگەڕێتەوە)

**ئەو ووتەیەی کە بەهێزە ئەوەیە هەرکەسێک هاوشێوەی ئەم زانایانە تەکفیر بکات بەبێ تەئویل ئەوا کافرە، لەبەر موخالەفەکردنی ئیجماعی ئوممەت، وە لەبەر ئەوەی تەکفیرکردنی زانا ناودارەکانی ئوممەت دەگەڕێتەوە بۆ تانەدان لە دین و پوچەڵ کردنەوەی شەرع.**

***

## پلەی سێیەم: ئەو کەسەی موسڵمانێک تەکفیر دەکات بەبێ تەئویل.

### ابن العطار الشافعي (رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ) دەڵێ:

هەرکەسێک موسڵمانێک تەکفیر بکات بە ناحەق یان پێی بڵێ (ئەی کافر) بەبێ ئەوەی پشت بە شتێک ببەستێ کە رووکەشەکەی کوفر بێت، ئایا بەمە کافر دەبێت ؟ ووتەی زانا (متأخر)ەکانی شافعی خیلافی تێدا هەیە بەسەر دوو شێوە:

**یەکەمیان:** ئەمەش ووتەی زۆرینەیانە: کافر نابێت بەڵکو گوناهبارە بەم شتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ ئەی کافر، گەر راست بێت ئەوا کافرە، ئەگینا بۆخۆی دەگەڕێتەوە) جا پێغەمبەر (ﷺ) بە راشکاوی باسی کافربوونی نەکرد بەڵکو مانای فەرموودەکەی ئەوەیە: گوناهی ووتەکەی بۆخۆی دەگەڕێتەوە.

**دووەمیان:** ئەمەش ووتەی فەرموودەناسان و لێکۆڵەرەوانە: کافر دەبێت، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) کوفرەکەی گەڕاندەوە بۆ خاوەنی ووتەکە گەر کەسی بەرامبەر هیچ کوفرێکی تێدا نەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی حوکمدان بە کافربوونی، خاوەنی کتێبی (التتمة) و خاوەنی کتێبی (البحر) ئەم ووتەیان هەڵبژاردووە، والله أعلم.

{الإعتقاد الخالص من الشك والإنتقاد : لا 278}

**راجح ئەوەیە: هەرکەسێک موسڵمانێک تەکفیر بکات بەبێ هەبوونی گومان و تەئویل ئەوا کافرە، هەروەک فەرموودەکان بەڵگەبوون لەسەری، جا داوای تەوبەی لێ دەکرێت گەر تەوبەی نەکرد ئەوا دەکوژرێت.**

### شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ) دەڵێ:

گەر کەسێک سووربێت لە تەکفیرکردنی کەسێک کە قورئان و سوننەت و ئیجماع روونیان کردۆتەوە کە تەکفیر ناکرێت، وە بۆی روون ببێتەوە کە کافر دەبێت بەم شتە، جا سووربێت لە جیابوونەوەی پێغەمبەر و شوێنکەوتنی رێبازێکی تر غەیری رێبازی ئیمانداران، ئەوا داوای تەوبەی لێ دەکرێت گەر تەوبەی نەکرد ئەوا دەکوژرێت.

{مجموع الفتاوى : 234/27}

***

**پلەی چوارەم: ئەو کەسەی موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە تەئویل.**

**ئەمەش دوو جۆرە:**

**یەکەم: ئەو کەسەی عەقیدەی فاسدە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە تەئویل.**

**حاڵی ئەمەش وەکو حاڵی ئەو خەواریجانەیە کە گوناهبارانی ئەهلی قیبلەیان تەکفیرکرد بە تەئویل، ئەم جۆرە کەسانە زانایان خیلافیان هەیە لە تەکفیرکردنیان لەسەر دوو شێوە:**

**ئەوەی دەڵێت کافرن ئەم فەرموودەیەی کردۆتە بەڵگە کە لە (الصحيحين)دا هاتووە:**

**لە "أبو سعيد الخدري"ەوە (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

لە پشتی ئەمەوە کەسانێک پەیدا دەبن قورئان دەخوێننەوە لە قورگیان تێپەڕ ناکات، لە دین دەردەچن وەک دەرچوونی تیر لە کەوانەوە، موسڵمانان دەکوژن و واز لە بت پەرستان دەهێنن، گەر من پێیان بگەم دەیانکوژم وەک کوشتنی قەومی عاد.

{متفق عليه} البخاري : ژ3344 ، مسلم : 2415

**(وەرگێڕ: فەرموودەکە مەبەستی "ذو الخويصرة"یە کاتێک بە پێغەمبەر (ﷺ)ی ووت: ئەی محمد دادپەروەر بە لە دابەشکردنی دەستکەوتەکان، چونکە بە دادپەروەری دابەشت نەکرد)**

**وە ئەوەی دەڵێت کافرنین ئەم ڕیوایەتەی کردۆتە بەڵگە کە بە صەحیحی لە "طارق بن شهاب"ەوە هاتووە کە دەڵێ:**

من لەلای (علي) بووم پرسیاری لێکرا دەربارەی خەڵکی نەهرەوان (خەواریجەکان) ئایا ئەوان موشریکن ؟ ووتی: لە شیرك ڕایان کردووە، ووترا: ئەی مونافیقن ؟ ووتی: مونافیقەکان یادی الله ناکەن تەنها کەمێک نەبێت، پێی ووترا: ئەی چین ؟ ووتی: کەسانێکن یاخیبوونە لێمان.

{رواه ابن أبي شيبة في مصنفه - بسند صحيح} ب 7/ لا 563/ ژ 37942

**الإمام الآجري (رحمه الله) دەڵێ:**

زانایان خیلافیان نەبووە لە کۆن و تازەدا کە خەواریجەکان کەسانێکی خراپ و سەرپێچیکەرن بۆ الله و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەگەرچی نوێژیش بکەن و ڕۆژووش بگرن

و زۆر عیبادەت بکەن، ئەمانە سوودیان پێ ناگەیەنێت..... خەواریجەکان فرۆشراوی پیس و بۆگەنن، وە هەر کەسێک کە لەسەر مەزهەبیان بێت لە خەواریجەکانی تر، ئەم مەزهەبە وەکو میرات لەیەکتری وەردەگرن لە کۆن و تازەدا، دەردەچن (خروج دەکەن) لە پێشەوایان و کاربەدەستان، وە کوشتنی موسڵمانان بە حەڵاڵ دەزانن.

**{الشريعة : 325/1} بە دەستکارییەوە**

**(وەرگێڕ: مەبەستی لە ووشەی "فرۆشراو" کە بە عەرەبی پێی دەڵێن "الشراة" خەواریجەکان ئەم ناوەیان لەخۆیان نابوو واتا ئەوان نەفسی خۆیان فرۆشتۆتە الله تعالى).**

### شێخی ئیسلام ابن تيمية (رحمه الله) دەڵێ:

ئوممەت یەکدەنگە لەسەر سەرزەنشتکردنی خەواریج و بە گومڕا دانانیان، بەڵام خیلافیان هەیە لە تەکفیرکردنیان، دوو ووتەی ناسراو هەیە لە مەزهەبی مالك و أحمد دەربارەی تەکفیرکردنیان، وە لە مەزهەبی الشافعي بە هەمان شێوە خیلاف هەیە لە تەکفیرکردنیان، هەربۆیە دوو ووتە هەیە دەربارەیان لە مەزهەبی أحمد و مەزهەبەکانی تریش. **{مجموع الفتاوى : 518/28} بە دەستکارییەوە**

### وەهەر ابن تيمية (رحمه الله) دەربارەی "خەواریج" دەڵێ:

لە ڕاستیدا ئەو ووتانەی کە ئەوان دەیڵێن کە دەزانرێ پێچەوانەی ئەو شتانەیە کە پێغەمبەر پێی هاتووە ئەوا کوفرە، وە کردەوەکانیان ئەوانەی هاوشێوەی کردەوەی کافرانە بەرامبەر موسڵمانان ئەمەش هەر کوفرە، بەڵام تەکفیرکردنی کەسێکی دیاریکراو لەوان، وە حوکمدان بە مانەوەی تاهەتایی لە ئاگردا، وەستاوەتە سەر چەسپانی مەرجەکانی تەکفیر و نەمانی ڕێگرەکانی تەکفیر. **{مجموع الفتاوى : 500/28}**

### دووەم: ئەو کەسەی عەقیدەی صەحیحە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بە تەئویل بەهۆی گومانێکەوە:

**ئەم کەسە تەکفیر و تەبدیع ناکرێت بەڵکو حوکمی لەسەر دەدرێت بەوەی کە هەڵەیە، هەروەک ڕوویداوە لە هەندێک لە هاوەڵان (رضي الله عنه) وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەکفیری نەکردن بەمە.**

**لە چیرۆکە ناسراوەکەی (حاطب)دا عمر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگام بدەن لە ملی ئەم مونافیقە بدەم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (حاطب بەشداری جەنگی**

بەدری كردووە، تۆ چوزانی لەوانەیە الله دەربارەی ئەهلی بەدر فەرموویێتی: چیتان دەوێت بیكەن من لێتان خۆشبوومە). {متفق عليه} البخاري : ژ 3007 ، مسلم : 6485

### لە "عائشة"ەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) دەربارەی ڕووداوی "الإفك" دەڵێ:

"أسيد بن حضير" بە "سعد بن عبادة"ی ووت: تۆ مونافیقی دەمەدەمێ دەكەین لەسەر مونافیقان. {متفق عليه} البخاري : ژ 2661 ، مسلم : 7120

(وەرگێڕ: یەكێک لەو هاوەڵانەی كە دەنگۆی ئەم بوختانە گەورەیەی بڵاودەكردەوە لە هۆزی خەزرەج بوو، سعد بن معاذ كە گەورەی هۆزی ئەوس بوو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر ئەو كەسەی ئەم بوختانە بڵاودەكاتەوە لە هۆزی ئەوس بێت ئەوا لە ملی دەدەین، وە ئەگەر لە برایە خەزرەجەكانمان بێت ئەوا دەیكوژین، لەم كاتەدا سعد بن عبادة كە گەورەی هۆزی خەزرەج بوو خۆشەویستی هۆزەكەی بەسەریدا زاڵ بوو بە "سعد بن معاذ"ی ووت: درۆ دەكەی نایكوژی و ناتوانی بیكوژی لەبەر ئەوەی لە خزمانی خۆت نیە حەز دەكەی بیكوژی، لەم كاتەدا أسيد بن حضير كە ئامۆزای سعد بوو بە "سعد بن عبادة"ی ووت: تۆ مونافیقی دەمەدەمێ دەكەی لەسەر مونافیقان..... بڕوانە صەحیحی بوخاری : ژ 2661).

### لە "عتبان بن مالك الأنصاري"ەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) دەڵێ:

یەكێک لە ئێمە ووتی: كوا "مالك بن الدخشن" ؟ هەندێكیان ووتیان: ئەمە مونافیقە الله و پێغەمبەرەكەی خۆش ناوێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: وا مەڵێ، ئایا نابینی ووتی لا إله إلا الله، بەڵكو مەبەستی ڕەزامەندی الله بێت بەم ووشەیە ؟ ئەویش ووتی: الله و پێغەمبەرەكەی زیاتر دەزانن، ئێمەش ووتمان: كرانەوە و قسەكردنی ئەو دەبینین بەرامبەر مونافیقان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: الله حەرامی كردووە لەسەر ئاگر ئەو كەسەی بڵێ: لا إله إلا الله مەبەستی ڕەزامەندی الله بێت بەم ووشەیە.

{متفق عليه} البخاري : ژ 425 ، مسلم : ژ 1440 - 1442

### لە "جابر بن عبد الله"ەوە (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) دەڵێ:

معاذ بن جبل (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) نوێژی دەكرد لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) پاشان دەچووە لای قەومەكەی پێشنوێژی بۆیان دەكرد، جا سوڕەتی "البقرة"ی دەخوێند، جا پیاوێک پێشنوێژی كرد بە نوێژێكی كورت، ئەم هەواڵە گەیشتەوە معاذ، معاذ ووتی: ئەو مونافیقە. {متفق عليه} البخاري : ژ 6106 ، مسلم : ژ 972

**ئیمام بوخاری لەسەرە بابەتی ئەم فەرموودانە نوسیویەتی (باب من لم یر إكفار من قال ذلك متأولا أو جاهلا) بەش: ئەو کەسەی ئەمانەی بە کافر دانەناوە کە بە تەئویل یان بە جەهل موسڵمانان بە کافر یان مونافیق ناو دەبەن).**

**(وەرگێڕ: کە دەڵێ "ئەو کەسەی" مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ).**

**شێخی ئیسلام ابن تیمیة (رَحِمَهُ اللَّهُ) دەڵێ:**

تەکفیرکردنی ئیماندار کوفرە، هەروەک پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: گەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ (ئەی کافر) ئەوا کوفرەکە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا گەر بە تەئویلەوە وابڵێت کافر نابێت، هەروەک عمر بن الخطاب بە "حاطب بن أبي بلتعة"ی ووت: (ڕێگام بدەمە لە ملی ئەم مونافیقە بدەم)، وە هاوشێوەی ئەمە وەکو ئەوەی أسید بن حضیر لە ڕووداى "الإفك" بە "سعد بن عبادة"ی ووت: تۆ مونافیقی دەمەدەمێ دەکەی لەسەر مونافیقان. {منهاج السنة النبوية : 505/4}

***

**پلەی پێنجەم: ئەو کەسەی کوفر بداتە پاڵ موسڵمانێک لەسەر شێوەی جنێودان و هاوشێوەکانی، نەوەک بڕوای وابێت کافرە.**

**ئەمە فاسق بوونە خاوەنی ووتەکە تەمێ دەکرێت، الله تعالى فەرموویەتی:** ﴿ وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ **[الحجرات : 11]**، (واتا: ناو و ناتۆرە لەیەکتر مەنێن ئەمە خراپترین ناوە دەینێن دوای ئیمان هێنان، وە هەرکەسێک تەوبە نەکات ئەوا لە زاڵمانە. موفەسیرەکان دەڵێن: بۆ نموونە کەسێکی یەهودی یان نەصرانی موسڵمان بێت تۆ دوای ئیمان هێنانی هەر بە یەهودی و نەصرانی ناوی ببەی، یان بە موسڵمانێک بڵێی مونافیق یان کافر وەکو جنێودان یان وەکو گاڵتەکردن).

**دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە لە "مجاهد و عكرمة"ەوە ڕیوایەت کراوە کە ووتویانە:** ئەمە ووتنی کەسێکە بە کەسێک (ئەی کافر) یان (ئەی مونافیق).

**وە لە "قتادة"ەوە ڕیوایەت کراوە کە دەڵێ:** بە برا موسڵمانەکەت مەڵێ فاسق، مەڵێ مونافیق، الله نەهی لە موسڵمانان کردووە لەم شتەدا و ئایەتی لەسەر هاتووە.

{رواهما الطبري في تفسيره : 301/22}

**لە (الصحيحين)دا هاتووە لە "ابن مسعود"ەوە (رضي الله عنه) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:** (سباب المسلم فسوق، وقتاله كفر).

**{متفق عليه} البخاري : ژ 6044 ، مسلم : ژ 133**

**(وەرگێڕ: واتا جنێودان بە موسڵمان فیسقە، شەڕکردن لەگەڵی کوفرە).**

**لە "ثابت بن الضحاك"ەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:**

(من لعن مؤمنا فهو كقتله، ومن قذف مؤمنا بكفر فهو كقتله).

**{متفق عليه} البخاري : ژ 6047 ، مسلم : ژ 218**

**(وەرگێڕ: واتا هەرکەسێک لەعنەت لە ئیماندارێک بکات گوناهەکەی وەکو کوشتنی وایە، وە هەرکەسێک کوفر بداتە پاڵ موسڵمانێک گوناهەکەی وەکو کوشتنی وایە).**

**ئیمام بوخاری ئەم دوو فەرموودەیەی لە صەحیحەکەیدا هێناوە لەژێر بەشی (ئەوەی نەهی لێکراوە لە جنێو و لەعنەت) "باب ما ينهى من السباب واللعن".**

**شێخی ئیسلام ابن تيمية** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

جا گەر تەکفیرکردنی کەسی دیاریکراو لەسەر شێوەی جنێودان وەکو کوشتنی وابێت، ئەی تەکفیرکردنی بە بڕواوە دەبێت چۆن بێت !؟ ئەمەیان لە کوشتنی گەورەترە، چونکە هەموو کافرێک خوێنی حەڵاڵ دەبێت بەڵام هەرکەسێک خوێنی حەڵاڵ بێت مەرج نیە کافر بێت. {الإستقامة : 65/1}

**(وەرگێڕ: بۆیە دەڵێت تەکفیرکردنی لە کوشتنی گەورەترە، چونکە جاری وا هەیە کەسێک دەکوژرێت بەڵام کافر نیە بەڵام هەرکەسێک کافر بێت ئیللا دەبێت بکوژرێت، تەنها ئەهلی ذیممە و خاوەنانی پەیمان و ئاگر بەست نەبن).**

**الكشميري** (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) **دەڵێ:**

زانایانی (المتأخر) دەڵێن گەر وەکو جنێودان وابڵێت کافر نابێت، بەڵام گەر بە بڕواوە وابڵێت ئەوا کافرە. {فيض الباري : 169/7}

**وە ڕیوایەت کراوە کە خاوەنی ووتەکە تەمبێ دەکرێت بە لێدان و هاوشێوەکانی.**

**لە "ابن عباس"ەوە** (رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمَا) **پێغەمبەر** (ﷺ) **فەرموویەتی:**

گەرکەسێک بە کەسێکی تری ووت: ئەی یەهودی ئەوا بیست جەلدەی لێدەن.

{رواه الترمذي في سننه - بسند ضعيف} ژ 1462

فەرموودەیەکی زەعیفە بە صەحیحی نەهاتووە

**وە بە صەحیحی لە "الزهري و قتادة"** (رَحِمَهُمَا ٱللَّهُ) **ڕیوایەت کراوە کە ووتویانە:**

گەرکەسێک بە کەسێک بڵێ: ئەی دز، ئەی مونافیق، ئەی کافر، ئەی عەرەق خۆر، لە هەموو ئەم ووتانەدا تەمبێ کردن هەیە. {مصنف عبد الرزق : ب 7/ لا 427/ ژ 13740}

**(وەرگێڕ: بێگومان گەر کەسەکە وانەبێت ئینجا خاوەنی ووتەکە تەمبێ دەکرێت).**

**بەڵام ئەو کەسەی کە موسڵمانێک تەکفیر دەکات بەهۆی عەقیدە صەحیحەکەیەوە، وەکو ئەو کەسەی کەسێک تەکفیر دەکات کە ئیثباتی صیفەتی (العلو)ی الله لەسەر بەندەکانی بکات، یان کەسێک تەکفیر دەکات کە بەندایەتی و حوکم و شەڕعدانانی تەنها بۆ الله داناوە، جا ئەم کەسە موشریکە کافرە، وە هۆکاری کافربوونی ئەوەیە کە ئەو تەوحیدی بە ناشرین داناوە و شیرکی بە جوان داناوە، بەمەش ئەصلی دینەکەی هەڵوەشاندۆتەوە.**

**شێخ عبد اللطيف بن عبد الرحمن آل الشيخ (رَحِمَهُ ٱللَّٰهُ) دەڵێ:**

هەرکەسێک تەکفیری موسڵمانانی ئەهلی تەوحید بکات یان توشی شەڕ و سزایان بکات، ئەوا ئەو کەسە لە خراپترین چینی کافرانە، لەو کەسانەیە ﴿ **الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ - جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ** ﴾ **[إبراهيم : 28-29]**، (واتا: ئەوانەی نیعمەتەکانی الله تعالى یان گۆڕی و خۆیان و قەومەکانیان شایستەی لە ناوچوون کرد - دۆزەخ دەوریان دەدات لە هەموو لایەکەوە کە خراپترین مەنزڵگایە) وە لە فەرموودەشدا هاتووە: (هەرکەسێک بە برا موسڵمانەکەی بڵێ "ئەی کافر" ئەوا بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە). **{عيون الرسائل والأجوبة على المسائل : 959/2}**

**ئەم جۆرەمان لە پلەکاندا باس نەکرد چونکە ئەو کەسەی کە ئیسلام بە ناشرین دادەنێت کافرە لە ڕووی هەڵوەشانەوەی ئەصلی دین، نەوەک لە ڕووی ئینکاریکردن و ڕەتکردنەوەی حوکمەکانی شەرع.**

***

# کۆتایی

به بەردەوامی زانایان دینی الله تعالی ڕوون دەکەنەوە بە هەموو ووردەکارییەکانیەوە، وە بەرگری لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، وە لە ئەهلی بیدعە دەدەن بە بەڵگە لە هەموو بابەتە شەرعیەکاندا، وە هەروەها بە بەردەوامی ڕەتی ئەوانە دەدەنەوە کە زیادەڕەوی یان شلڕەوی دەکەن بەتایبەتی لە بابەتی تەکفیردا، بۆ بەرپاکردنی حەق و بەزەیی هاتنەوە بە خەلق.

کەسێک وورد ببێتەوە ئەوا دەبینێت کە ئەوەی زانایان نوسیویانە لەم بابەتەدا وەکو پزیشکێکی لێزان وان کە دەرمانی گونجاو بۆ هەموو دەردێک باس دەکەن، جا دەیان بینی ڕەتی کەسی زیادەڕەو لە تەکفیر دەدەنەوە بەو بەڵگانەی کە هاتووە دەربارەی تەکفیرکردنی موسڵمان بە ناحەق، هەروەک چۆن ڕەتی کەسی شلڕەو لە تەکفیر دەدەنەوە بەو بەڵگانەی کە هاتووە دەربارەی وەستان لە تەکفیرکردنی کافر، بۆ ئەوەی هەمووان لەسەر ڕێگای پێکان (صواب) کۆ بکەنەوە.

ئەمە شێخی ئیسلام "ابن تیمیة"یە (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبی (الصارم المسلول على شاتم الرسول ﷺ) دەنوسێت لەبەر ڕووداوێک کە بووە هۆی ئەوەی کوفری جنێودەر بە پێغەمبەر (ﷺ) ڕوون بکاتەوە.

وە ئەمە "البقاعي"ە (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبی (إرشاد الغبي إلى تكفير ابن عربي) دەنوسێت دوای ئەوەی بینی خەڵکی ڕاجیان دەربارەی "ابن عربي".

ئەمەش شێخی نوێکەرەوەی دینە "محمد بن عبد الوهاب" (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبی (کشف الشبهات في التوحيد) دەنوسێت بۆ ئەوەی عەوامی موەحیدان بتوانێت گومانەکانی کەسانی دەمەدەمێکەر لەسەر شیرك و موشریکان برەوێنێت.

بە هەمان شێوە شێخ "عبد الله بن عبد الرحمن أبا بطين" کتێبی (الإنتصار لحزب الله الموحدين والرد على المجادل عن المشركين) دەنوسێت.

وە ئەمەش شێخ "محمد الكشميري"ە (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبی (إكفار الملحدين في ضروريات الدين) دەنوسێت.

لە بەرامبەردا دەبینین "ابن حزم الظاهري" (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبێک دەنوسێت بە ناونیشانی (الرد على من كفر المتأولين من المسلمين).

وە دەبینین شێخی عەللامە "ابن ناصر الدين الدمشقي" (رَحِمَهُ اللَّهُ) کتێبی (الرد الوافر على من زعم أن من سمى ابن تيمية "شيخ الإسلام" فهو كافر) دەنوسێت.

**وه "القاضي عمر بن موسى الحمصي الشافعي" (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) (قصيدة تائية في إنكار تكفير العلاء البخاري لابن تيمية) دەنوسێت، بە هەمان شێوە قەصیدەیەکی هەیە بە ناونیشانی (الشهب العلية في الرد على من كفر ابن تيمية).**

**وە دەبینین "الإمام الشوكاني" (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) کتێبی (إرشاد الغبي إلى مذهب أهل البيت في صحب النبي ﷺ) دەنوسێت، بۆ ئەوەی ڕەتی ئەوانە بداتەوە کە وادادەنێن "آل البيت" تەکفیری هاوەڵان دەکەن.**

**وە دەبینین شێخ "عبد اللطيف بن عبد الرحمن آل الشيخ" (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) کتێبی (مصباح الظلام في الرد على من كذب الشيخ الإمام ونسبه إلى تكفير أهل الإيمان والإسلام) دەنوسێت، بۆ بەرگریکردن لە شێخی نوێکەرەوەی دین "محمد بن عبد الوهاب" وە ڕەتدانەوەی ئەوانەی کە تۆمەتباریان کردووە بەوەی کە هەموو موسڵمان تەکفیر دەکات.**

**وە لەم سەردەمەشدا کە گومانەکانی ئەهلی زیادەڕەوان و ئیرجاء کەوتۆتە ناو بابەتی وەستان لە تەکفیرکردنی کافران و موشریکان، موەحیدی کردۆتە نامۆ لەنێوان ئەوانەی کە دەمەدەمێ دەکەن بە شتی باطل لەم بابەتەدا. موەحید لەخۆی دەترسێت تۆمەبتار بکرێت بە زیادەڕەوی یان بە ئیرجاء لێرە و لەوێدا، جا پێویستە لەسەرمان لایەنە هەرە گرینگەکانی ئەم بابەتە ڕوون بکەینەوە و باسی بەشەکان و پلەکانی بکەین، وە ئاماژەدان بەو شتانەی کە یەکدەنگی لەسەرە، یان خیلافێکی ڕەچاوکراوی (المعتبر) لەسەرە، بۆ ڕاگەیاندنی سوننەت و ئاشکرانی حەق و بڕینی زمانی ئەوانەی کە دەمەدەمێ دەکەن بە شتی باطل، وە بۆ لابردنی خراپە.**

**با موەحیدی سووربوو لەسەر شوێنکەوتنی حەق ئاگاداربێت لەوەی کە مەنهەجی ئەهلی سوننە و جەماعەت لە بابەتی وەستان لە تەکفیرکردنی موشریکان مەنهەجێکی مامناوەند و ڕێکە لەنێوان هەموو مەنهەجەکاندا، حەقە لەنێوان دوو باطل دا، ئیمانە لەنێوان دوو کوفردا، سوننە لەنێوان دوو بیدعەدا، الله هیدایەتدەرە بۆ پتەوترین ڕێگا.**

## **عەللامە ابن القيم (رَحِمَهُ ٱللَّهُ) دەڵێ:**

باشترینی کارەکان مامناوەندییەکەیەتی، وە خووڕەوشتە جوانەکان هەموویان مامناوەندن لەنێوان هەردوو لای زیادەڕەوی و شلڕەوی، بە هەمان شێوە دینی ڕاست مامناوەندە لەنێوان دوو لاداندا، وە بەهەمان شێوە سوننەت مامناوەندە لەنێوان دوو بیدعەدا، وە بەهەمان شێوە پێکان (صواب) گەردەتەوێت بە دەستی بهێنیت لە بابەتە خیلافیەکاندا ئەوا ڕەئیەکی مامناوەندە لەنێوان دوو ڕەئی دوور لە یەکتر.

**{روضة المحبين ونزهة المشتاقين : لا 220}**

وە ئەم کتێبە (الباعث على إتمام الناقض الثالث) لە ژێر دەنگی گوللـە و بۆردومان کردنی فڕۆکەکان نوسراوە لە دەوڵەتی خیلافەتی ئیسلامی (أعزها الله تعالى) ئەو دەوڵەتەی کە تاکو ئێستاش قەڵایەکی پارێزراوە و ئەمینە کە ئەهلی سوننە و جەماعەت پەنای بۆ دەبەن لەم هێرشە توند و خراپەدا بۆ سەر سوننەت و ئەهلی سوننەت لە تەواوی جیهاندا، وە تاکو ئێستاش سەرکردە ڕاستگۆکانی و فێرخوازە ڕۆچووەکانی زانست تیایدا ئاڵای سوننەت هەڵدەگرن و ڕێگا بۆ ڕێبوارانی ڕێگاکە ڕۆشن دەکەنەوە، وە ئەهلی بیدعە بنبڕ دەکەن لە هەموو بابەتە شەرعیەکاندا.

هەروەک چۆن الله تعالى بە عیلم و حیکمەتیەوە قەدەری وابووە کە دەوڵەتی ئیسلامی لە چینە جیاوازەکانی کافران و مورتەدان بدات بە شمشێر و ڕمح، وە الله سبحانە قەدەری وابووە کە دەوڵەتی ئیسلامی لە چینە جیاوازەکانی ئەهلی بیدعە بدات بە بەڵگە، وە الله تعالى بەندەکانی سەردەخات بەسەر هەموو ئەمانەدا بە منەت و فەزڵ و چاکەی خۆیەوە.

جا داوا لە الله تعالى دەکەین یارمەتیمان بدات لە زیندووکردنەوەی سوننەت و لەناوبردنی بیدعە، وە دەنگمان کۆ بکاتەوە لەسەر حەق، وە سەرمان بخات بەسەر هەموو دوژمنەکانی.

**وصلى الله على عبده ورسوله محمد، وعلى آله وصحبه أجمعين، وعلى من اتبعهم بإحسان إلى يوم الدين وسلم تسليما كثيرا.**

***